شەهید عوسمان عوزیری

# شۆرشی دیاربەکر

ئامادەکردن و ڕێکخستنەوەی

بەرزان حاجی ئیبراهیم چەرمەگا

# بێ گۆڕو شوێن بەدەم باوە
# لاشەم وردەو توڕ دراوە


## شەهید عوسمان عوزێری

ناوی کتێب: شۆڕشی دیار بکەکر
نوسینی: شەهید عوسمان عوزێری
ئامادەکردن و ڕێکخستنەوەی:
بەرزان حاجی ئیبراهیم چەرمەگا
کۆمپیتەر: مەڵبەندی ڕێکخستنی
سلێمانی
تایپی کۆمپیوتەر: هەوار ئەحمەد
ڕەشید
بەرگ: جەبار فارس و سامان حمە صالح
تیراژ: ٥٠٠
چاپی دووەم
چاپخانەی ئۆفسێتی داناز
ژمارە سپاردن: ٣٩٥ ساڵی ٢٠٠٠

## پێشکەشە بە..

*هەموو ئەو شەهیدانەی کورد کە بۆ پیرۆزی رزگاری گەلی کوردستان گیانیان بەخشی.

*سەرجەم ئەو قەڵەمە راست بێژانەی داکۆکیان لە مافی کورد کردووە.

*ئەو ئەدیبو نوسەرانەی بە راستگۆیی مێژووی گەلی کوردیان نوسیوەتەوەو بەردەوامن لەو خەباتەدا.

| سەرنج/ ئەم پەرتوکە چاپی یەکەمی لە ساڵی ١٩٦١ لەسەر ئەرکی حاجی ئیبراهیمی چەرمەگە بەچاپ گەیەنراوە. |
|---|

## سوپاسو پێزانینم بۆ..

-بەرێز کاک شەماڵ عەبدولوەفا، کە هاوکاری دڵسۆزانەی کردم.

-بەرێز مامۆستا عومەر مارف بەرزنجی، کە هاوکاریو زانیاری زیاتری پێ بەخشیم.

-بەرێز برای شاعیر ئاوات حەسەن ئەمین کە ماندوو بوو لەگەڵ زانیارییەکانی بەچاپ گەیاندنی ئەم کتێبە.

-بەرێز ئازاد سەوزە کە بە خەمخۆری دڵسۆزییەوە هاوکاری کردم.

-بەرێز هیوا رەئوفو بەرێز محەمەد مەردان کە هاوکارییان کردین لەروی ئەدەبییەوە.

بەرزان حاجی ئیبراهیم چەرمەگا

# دەستپێك

بەڕێزان حاجی برایم چەرمەگا

توێژینەوەو لێکۆڵینەوە لەسەر ژیانی نوسەرێك لە نێو میللەتێکی بەش مەینەتی وەکو کورددا هەوڵو ماندوبوونی زۆری پێویستە، هەرچەندە روپەڕی زۆربەی رۆژنامەو گۆڤارە کۆنەکانم پشکنیو پرس و راوێژی زۆرم بە هاوڕێیانی (شەهید عوسمان عوزێری) کرد بۆ ئەوەی تیشکی زیاتر بخەمە سەر ژیانو بەرهەمو لایەنە نادیارەکانی ئەم نوسەرە شەهیدە، هیندەی لەتوانام دا بووە درێخی خودیم نەکردووەو کاتی خۆی لە دیوانە شیعری (شەهید عوسمان عوزێری) کە ساڵی ٢٠٠٠ بە چاپمان گەیاند کە کۆی شیعرە بڵاوکراوەو بڵاونەکراوەکانیەتی بە چڕو پڕی ئەو زانیاریانەی ژیانی ئەم نوسەرەمان بڵاوکردەوە، بەڵام ئەوسا دەمزانی ئەم نوسەرە شەهیدە زیاتر هەڵدەگرێ لەسەری بنوسین، دیسانەوە لە پرۆژەی کۆکردنەوەو لەسەر نوسینو بەچاپ گەیاندنەوەی بەرهەمەکانیدا گوزەرێکم کردەوە بەناو رۆژنامەو گۆڤارەکانداو هەندێ شتی بابەتیم چنگ کەوت کە دەکرێت لە ئایندەدا پرۆژەیەکی رۆشنبیری چاك پێکبهێننو هیوادارم روناکی پاپ ببینن.

ئەم نامیلکەیەی بەردەستیش یەکێکە لەو پرۆژانەو بە نیاز بووم لەگەڵ چەند نوسینێکی رۆژنامەی خەبات ساڵی ١٩٦٠-١٩٦١ لە دووتویێ یەك کتێب دا چاپیان بکەم بەڵام بە پرسی هاوڕێیانم بە چاکم زانی جارێ تەنها ئەم نامیلکە مێژووییە بە چاپ بگەیەنم. هیوادارم

گیانی شەهید عوسمانی پێ شادبێت‌و سودێکیش بگەیەنێت بە خوێنەری کورد.

هەر لەم ناملکەیەدا بەچاکم زانی ئەو خوێنەرە خۆشەویستانەی دیوانی شەهید عوسمان عوزێری بەردەستیان نەکەوتووە، گوزەرێك بە ژیانی ئەم نوسەرە چەلەنگەدا بکەن‌و شارەزایی تواناو لێهاتویی ئەم شەهیدە نوسەرە بن بە هیوام ئەمیش سودی خۆی هەبێت.

## ژیاننامەی شەهید عوسمان عوزێری

ئەم نوسەرە خاوەن هەڵوێستە شەهیدە ناوی (عوسمان ئەحمەد رۆستەم)ەو ساڵی ١٩٣٦ لە دایك بووەو لە عەشیرەتی عوزێری‌یەو نازناوی ئەدەبی‌و سیاسیشی (عوسمان عوزێری) بووە.

ساڵی ١٩٤٤ لە شاری سلێمانی‌و لە قوتابخانەی ئەیوبییە خراوەتە بەر خوێندن‌و قۆناغی خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی بەسەرکەوتوویی لە سلێمانی تەواو کردووە. لە تەمەنی ١٧ ساڵیەوە تێکەڵاو بووەو بە ژیانی نوسین‌و وەکو پەیامنێر لە رۆژنامەی (ژین)ی سەردەمی مامۆستا گۆران هەندێ بابەتی ئامادەکردووەو ئەمە بوەتە سەرەتایەکی باش‌و بەهرەو توانای رۆژ بە رۆژ زیاتر چرۆی کردوەو گوڵی بەهرەی بەخشیوەتە گەلەکەی.

ساڵی ١٩٥٧ بۆ تەواو کردنی خوێندن روی لە بەغدا کردوەو لەگەڵ ژمارەیەکی دیار لە خوێندکارانی کورد ئەو کاتە لە بەغداد (کۆمەڵی ئاوازی کوردی)یان پێکهێناوە کە ناوەندێکی رووناکبیری‌و هونەری گشتگیر بووەو سەر بە (یانەی سەرکەوتنی کوردان) بووەو چەندین ئاهەنگ‌و شانۆیی کوردی‌و کۆڕیان ساز کردووەو تواناو لێهاتویی

(عوسمان عوزێری) دیار بووەو جێگەی متمانەی هاوڕێکانی بووە. هەر لەو ساڵانەدا توانیویەتی بەزیرەکی خۆی مۆڵەت بەدەست وەربگرێ بۆ پێشکەش کردنی بەرنامەیەك لە رادیۆی بەغداو لێهاتوانەو لێزانانە لە ئێزگەی کوردی بەغداوە بەرنامەی (خەباتی کوردستان)ی پێشکەش کردووە ناوەرۆکی بەرنامەکەی مێژوو تێکۆشانی کورد بووە لە ناوچە جیاوازەکانی دابەشکراوی کوردستاندا.

هەروەها لە بەرنامە رۆشنبیرییەکانی ئێزگەی کوردی بەغدا جار جارە پشتی خزمەتکرنی خۆی هەبووە. ئەو ساڵانە بووەتە ئەزمونێکی دیارو گرنگ لە ژیانی دوایی شەهید عوسمان عوزێریدا. لێرەدا پێویستە بڵێم ئەفسوس داخۆ چەند نوسینی بەبایەخی لەو بوارەدا لەناو چوون گەر بمانایەو لەبەر دەست بونایە بێگومانم خزمەتی گەورەیان بەگەلی کوردو خوێندەوارانی دەگەیاند.

(عوزێری) نوسەر وەکو بیریارێکی بەئاگای رۆشنکەر چەند وتارێکی سیاسیو لێکۆلیاری بۆ رۆژنامەی (خەبات)ی ئەو ساڵانە نوسیوەو بڵاوکراونەتەوە یەکێك لەو نوسینانە تایبەتە بە یادی (چوار ئەفسەرە شەهیدەکەی کوردستان)، کە لە ژمارە ٢٤٦-١٩ حوزەیرانی ١٩٦٠ بڵاوبوەتەوە زۆر هەوڵمان دا ئەو ژمارەیەمان دەست نەکەوت تاکو هاوشانی نوسینەکەی بڵاوبکەینەوە لەم نامیلکەیەدا هیوادارم لە ئایندەدا ئەو بوارە برەخسێت، زۆریش لەو نوسینە سیاسیانەی وەکو کۆڕی فیکری-سیاسی لە ئەڵقە رۆشنبیریەکان خوێندۆتەوە بۆ ئامادەبوانی کۆڕەکانی.

شەهید (عوسمان عوزێری) لە ژیانی خۆیدا توانیویەتی ئەم پەرتوكو نامیلکانە بەچاپ بگەیەنێت:

١.کۆمەڵـە شـیعری (گوڵـزاری کوردسـتان) سـاڵی ١٩٥٨ بـە چـاپ گەیەنراوە.

٢.لـە پێنـاوی دادپـەوەریدا دوو چیرۆکـە یـەکێکیان وەرگـێردراوە ساڵی ١٩٥٩ بەچاپ گەیەنراوە.

٣.مێـــژووی جوڵانـــەوەی مامۆســـتایانی پۆڵـــەندە بابـــەتێکی لێکۆڵینەوەیـە لەسـەر خـەباتی ڕێکخراوەیـی مامۆسـتایان وەرگـێراوە، ساڵی ١٩٥٩ بەچاپ گەیەنراوە.

٤.کۆمەڵە شیعری (کڵپەی دەرون) ساڵی ١٩٦٠ بەچاپ گەیەنراوە.

٥.شۆڕشـی دیاربـەکر لێکۆڵینەوەیـەکی کورتـی مێژوویـی ئـەو شۆڕشەو هۆکارەکانی نوشستی‌یە، ساڵی ١٩٦١ لەسەر ئەرکی حاجی برایمی چەرمەگا بەچاپی گەیاندووە. ئەم نامیلکەیە بایەخی بەڵگەیی هێندەیە کە بەرێز (دکتۆر کەمال مەزهەر) لە کتێبی مێژوودا ئاماژەی پێدەدات.

ئەم نوسـەرە پێشڕەوە پێشـبینی زۆر لـە ڕووداوەکـانی کـردووە و بـەردەوام بـووە لەســەر نوســین و وەرگــێران، لــە بــواری نوســین دا (ئەشـکەنجەی خۆشەویسـتی)و (یاسـای قازییـەتی) کـە هــەردوکیان ئەزمونی چیرۆك نوسین بوون روناکی چاپیان نەبینیوە.

لە بواری وەرگێران دا دوو کتێبی گرنگی وەرگێراوە کە بە داخەوە لـە کـاتی خۆیـدا چـاپ نـەکراون بڵاونەکراونەتـەوە، ئـەوانیش (مـیر، نوسینی ماکیاڤیللی)و (ماجدۆلین) کە مستەفا لوطفی مەنفەلوطی وەری گێراوەتە سەر عەرەبی‌و ئەمیش کردویەتە کوردی.

ئەو کتێبانەی شەهید عوسمان عوزێری ئێستاش گرنگی‌و بایەخی خۆیان هەیەو خوێندنەوەی نوێش هەڵدەگرن.

عوسمان عوزێری لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە لەگەڵ مامی (حاجی برایمی چەرمەگا)و خزمانی عشیرەتی عوزێری بەشداری کردووە لە شەڕی دەربەندی بازیان و بریندار کراوەو برایەکیشی بەناوی (عەبدوڵا ئەحمەد ڕۆستەم) لە ١٩٦٣ شەهید کراوە بەڵام کۆست و زیندان و مەینەتیەکانی ڕۆژگار شانیان لانەکردووەو بە کێوی وەرەی باڵای ئەو نەگەیشتون. بەردەوامی لەنێو خەبات و تێکۆشان دا زیاتر قاڵی کردوو گیانی کوردایەتی زیاتر گەشە پێداو دانەبڕاوانە بەردەوام بوو لە خەبات و شۆڕشگێڕیەو لە ژیانی خەباتی شاخیش دا کادرێکی سیاسی و ڕاگەیاندنی هۆشیاری شۆڕشی ئەوسای کورد بوو. لە ئیزگەی دەنگی شۆڕشی ئەیلول لەگەڵ نوسەران و شارەزایان ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لە خزمەت کردن. هەوڵی دەدا لە ڕێگەی دەنگی ئیزگەی شۆڕشەوە وەکو کوردێکی جوامێر و جەربەزە بە ئایندەی سەرفرازی گەلەکەی وای لێ کردووە هەمیشە پشتگیری شۆڕشی کردووە و ڕۆڵی خۆی لە خەباتی ڕزگاری خوازی گەلەکەی بینیوە.

لە درێژەی ژیانی ئەدەبی و هونەری و سیاسی (عوسمان عوزێری) بەلەخۆ بوردویی یەوە توانیبوی متمانەی زۆرینەی هەڤاڵانی بەدەست بهێنێ و هۆشمەندی و ڕووناکبیری لە ئاستێك دابووە هاوڕێیانی بەتێڕامانەوە سەیری قەڵای بەهرەو تواناى ئەم نوسەرەیان کردووە.

نوسەرێکی تەمەن ٢٩ ساڵ ئەو هەموو چاپ کراوو پەرتوك و نوسین و بەرنامە ڕادیۆییەی هەبوو بێت بێگومان دەبێت بەسەرنجەوە سەیری ژیانی پڕ بەهرەی بکرێت، بەڵام بەداخەوە ساڵی ١٩٦٦ ڕوناکی هۆشمەندی ئەم نوسەرە خامۆش کراو عوسمان عوزێری شاعیرو نوسەرو وەرگێڕو کادری سیاسی و ڕاگەیاندن شەهید کرا لە پاش خۆی

تەنها کوڕ و کچێکی بەجێ ماو بەناوی (ڕاپەڕ و شیرین) کە ئێستا لە هەندەرانن.

شێرکۆ بێکەسی شاعیر لە دیوانە شیعری (خاچ و مار و ڕۆژمێری شاعیرێ) لاپەڕە ١٧٣دا بەم شێوەیە باسی شەهید عوسمان عوزێری و شەهید بوونی دەکات:

چوارگۆشەیەکی هاوڕێی ناو ئەشکەوت بوین
هەموو جارێ سەرمان ئەنا
بە بازنەی ئەشکەوتەوە
تا ئەویش خەوی لێ ئەکەوت
لەبەر ئاگری رازی یەکدا دائەنیشتین
بەیانیەك (عوسمان)یان برد
عوسمان وەکو مورویەکی چاوشین
وەکو شیعرێکی سەربالْ شین
لە ڕنو بەفری دیلمان و هۆمەران و گەلاڵەدا
ونیان کردو نەهاتەوە
نەهاتەوەو نەهاتەوەو نەهاتەوە

لەراستەوە بۆ چەپ: عوسمان عوزێری، محەی هـەرکی، حـاجی برایمـی چەرمەگا، وەزیری خارجی میسری. ساڵی ١٩٦٥ لە میسر.

عوسمان عوزێری

# چە پکێ رازو بەسەر کردنەوە

عومەر مەعروف بەرزنجی

بەرکول:

کورد وەکو نەتەوەیەکی دێرین‌و پەژمردەی رۆژهەلات، لاپەرەکانی مێژووی ئەدەب‌و بزوتنەوەی نەتەوایەتی‌و خەباتی نیشتمانی سەر رێژن لە نموونەی بالاو وێنەی درەو شاوەو تابلۆی نەخشاوو شەهیدانی گومناوو رێبوارانی بەئاگای رێگای سەرفرازی‌و خەمخۆری رۆژانی کسپەو نەهاتی‌و وەیشومەکانی رۆژگار.

برادەری ئازیزو شاعیرو نوسەرو خەباتکاری نەگۆڕ (عوسمان عوزێری)شەهید، شاگولێکی گەشاوەو بەرەونەقی ئەو لاپەرە رەنگین‌و تۆمارە پرشنگدارەیە کە مێژووی نەتەوایەتی بە شانازی‌و شەوق‌و ئەلهاوە دەوری دەکاتەوە.

کاکە عوسمان خوێندەوارێکی تازە هەلکشاوی بەهرەمەندو شاعیرێکی دیارو نوسەرێکی کارامەو چیرۆك نوسێکی بەتوانست‌و بیری رۆشن‌و وەرگێرێکی بەسەلیقەو رۆلەیەکی بەئاگای مێژووی نوێ‌و خەباتکاری کە نەبەردی رۆژانی تەنگانەو گوشراوی باوەری پیرۆزی کوردایەتی بوو، سی‌و شەش سال لەمەوبەرو لەبارو دۆخێکی گرژو رۆژگارێکی تەماوی ئەم نەتەوەیەداو بە رووداوێکی مەرگەسات ئاسایی جەستەی شەکەتی خەلتانی خوێن کراو کالای مەرگی لەبەر هەلکێشراو رووی لە ژیانی جاویداتی کرد.

ئەم برادەرە بەوەفاو رچەشکێنە لەسەرەتاوە تابنەتای رۆژانی ژیانی نمونەیەکی رەزا سوكو بەئارام بوو، کارو هەڵسورانی ژیانی بەپێی بەرنامەیەکی دروستو دارێژراو بوو، جۆشو تەوژمو سەودای کوردایەتی‌یەکی راستەقینە لە هەموو جەستەو دەمارەکانی‌دا قوڵپی دەدا، لەیەکەم گوللەی شۆڕشی رزگاریخوازی ئەیلولەوە چەکی تۆڵەو خەباتی نایە نەرەی شانی‌و بەشداری‌یەکی کارای کردو برینداریش کرا، بەلام مایەی داخو نیگەرانی‌یە کە ئەم رۆڵە بزورگە خراوەتە گۆشەی بێئاگایی‌و بیر چوونەوەو تەنانەت یادێکیشی نەکراوەتەوە.

سەرەتای ژیانی ئەدەبی:

سەرەتای هۆگربوونو رووکردنە جیهانی ئەدەبو رووناکبیری‌و هەوڵو تەقەللای لەم بوارەدا دەگەڕێتەوە بۆ ناوەراستی ساڵانی پەنجای سەدەی رابردوو، لەو رۆژگارەداو لەسەر رووبەری لاپەرەکانی (ژینو هاتاوو پێشکەوتن)و چاپەمەنی‌یەکانی‌تر هەندێ لە نۆبەرەو بەرکوڵی قەڵەمی دەبینرانو بەخوێندەواران ئاشنا بوو، بەلام شۆڕشی چواردەی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ وەك شۆڕشێکی نیشتمانی کاریگەرێتی‌یەکی سەرو مڕی بەسەر ژیانی ئەدەبی (عوزێری)یەوە هەبوو، بووە مایەی تەقینی کانیاوی روونی بەهرەو گەشەسەندنی چالاکی‌و فراوان بوونی مەودای نوسینو بلاوکرنەوە، لەم سەردەمەدا رۆژنامەی خەباتو گۆڤاری شەفەق لاپەرەکانی بۆ ئاواڵە کردبوو، ئەمە جگە لە چاپکردن چەپکێ بەرهەمی ئاوازە.

## بەرهەمەکانی عوزێری:

ئەو بابەتانەی کە (عوزێری) ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیدا کردبوون و دەیویست لێ یان نزیک ببێتەوەو ببنەمایەی سەرنج و رامان و بایەخ پێدانی هەمە رەنگەن و خوا لێ خۆشبوو بەیەك جۆری رووناکبیری قنیاتی نەکردووەو لە چەند دەرگایەکی ئەدەبی و رووناکبیری و مێژوویی داوەو بە ویست و تاسوقێکی بێ سنورەوە لە هەموو گوڵێکی بۆن خۆش بۆ نێکی کردووە، شیعر، چیرۆك، شانۆیی، وەرگێران، بابەتی رەخنەیی، باس و خواستی کۆمەڵایەتی، وتاری سیاسی، تۆمار کردنی بەسەرهات و رووداوی مێژوویی، ئەمانەو هەندێکی تریش بەردەوام میوانێکی بە ئەمەك و رەزا سوکی دەست و قەڵەم و بیری رۆشنی کاکە عوسمان بوون.

ئێمە لێرەدا ناتوانین و ئەو هەلە نەرەخساوە کە لە مەودا یەکی بەرین و باسێکی سەرتاپا گیریدا قەڵەمی توێژینەوەو هەڵسەنگاندن و بە باڵا بڕینێکی هەمە لایەنە بژەنینە کرۆك و مەبەست و بیری ئەم شەهیدە باڵایەو سەرجەم بەرهەمەکانی بەسەر بکەینەوە، بەڵام رێی ئەوەیشمان لێ نەگیراوە کە بە نوکە قەڵەمێکی درشت و رێبوار ئاسایی کارەکانی بخەینە بەر چاوی خوێندەوارانی کورد.

## عوزێری و شیعر:

عوسمان عوزێری لە رۆژگارێکدا چاوی کردەوەو بە حەزو ویست و تامەزرۆیی یەوە رووی لە میحرابی پیرۆزی شیعر کردو ئالودەی بوو، کە ئەم بابەتەی ئەدەبی کوردی لە شێوەو ناوەرۆك دا هەنگاوی گەورەی دەناو بەرگی خەملاندن و تازە گەرێتی بە بەردا هەڵکشا بوو، دیارە

(عوزێـری) وەك قوتابی‌یـەکی زرنگـی قوتابخانـەی شـیعری تـازە لـەم گۆرانکاری‌یـەدا لاتـەرێك نـەبوو، بـە کـوڵ‌و دڵ بەشـداری تێـدا کـردو شـیعرەکانی ئـەو سـەردەمەو دواتـری شـێوەیەکی هونـەری لـەبارو کەرەستەو ناوەرۆك‌و تان‌و پۆیەکی نەخشاویان بەخۆوە گرتبوو، لەپاڵ شیعرەکانی گۆران‌و هـەردی‌و کامـەران‌و دیـلان‌و ع ح ب‌و عـەلی فـەتاح دزەیـی‌و مـەدهۆش‌و کـامیل ژیـرو دکتـۆر ئیحسـان فوئـادو جـەمال شارباژێری‌دا سەرجەم بـوو بوونـە نمونـەی هـەڵبژاردەی شـیعری ئـەو قۆناغـە تایبەتی‌یـەی نەتـەوەی کـوردو هەرێیەکەیشـیان لـە ئاسـتێکی هونەری تایبەتی‌دا بوون‌و یارە (گۆران)ی گەورەیش مامۆستاو رابەرو سەردەستەی هەمووان بوو.

عوزێری لە دوای شۆڕشی چواردەی تەمووزی ۱۹٥۸ بە ماوەیەکی کەم مسۆدەی کۆمەڵە شیعرێکی بە نـاوی (گوڵـزاری کوردسـتان)و بـە پێشەکی‌یەکی چڕو پڕی (محەمەد ساڵح دیلان)ەوە خستە کتێبخانەی کوردی‌یەوە.

ساڵی ۱۹٦۰ کۆمەڵە شیعری دووەمی بەناوی (کڵپەی دەروون)و لە ناوەرۆك‌و بەرگ‌و نەخشە سازی‌یەکی رەنگین‌و کالآیـەکی بـەرەو نەتـەوە بڵاوکردەوە.

دیـارە شـیعرەکانی عوزێـری‌و شـێوەو نـاوەرۆك‌و رەوتـی هونـەری بابەتەکان پێویستی‌یان بە توێژینەوەیـەکی قووڵ‌و بەسـەرکردنەوەیەکی بەرباڵو هەیەو ئومێدەوارم ئەو هەلەیش برەخسێ.

**عوزێری و وەرگێران:**

عوزێری جگە لە بواری شیعر دەیویست کە لە وەرگێرانی بابەتی بەپێزدا دەورێکی هەبێ و لەم ڕێگەیەشەوە خزمەتێ بە خەرمانی ڕووناکبیری کوردی بگەیەنێ.

دیارە عوزێری لە نرخ و بەهاو پێویستی وەرگێران تێگەیشتبوو، دەی زانی کە کتێبخانە چۆلەکەی ئەدەب و ڕووناکبیری کوردی پێویستی‌یان بە بابەتی هەمەرەنگی جیهانی هەیەو ڕاپەراندیشی لە ئەستۆی خوێندەوارانی کورددایە.

ساڵی ١٩٥٩ نامیلکەی (مێژووی جولانەوەی مامۆستایان لە پۆلەندە)ی وەرگێرایە سەر زمانی کوردی و بە چاپی گەیاند، هەر لەو ساڵەدا شانۆنامەی (لە پێناوی دادپەوەری) نوسەر (وجیه رضوان)ی لە نامیلکەیەکی تایبەتی‌دا وەرگێراو بە چاپکراوی خستی‌یە کتێبخانەی کوردی‌یەوە، سەرەرای ئەم دوو بەرهەمە چاپکراوە چەند بابەتێکی تریشی ئامادە کرد بەلام مەرگی لەناکاو مۆڵەتی نەدا ڕووناکی ببینێت.

**عوزێری و چیرۆکی کوردی:**

ڕاستە عوزێری وەك شاعیرێکی بەسەلیقەو خاوەن هەڵوێست ناسراوە، بەلام سەرەرای ئەم بوارەیش لەبەرەو پێش چوونی چیرۆك و نوسینی چیرۆکی کوری‌دا بەشدار بووەو مەڵۆیەکی خستووەتە سەر شارای تۆماری چیرۆك.

لە ناوەراستی ساڵانی پەنجای سەدەی ڕابردوودا کەسانی وەك (محەرەم محەمەد ئەمین، مستەفا ساڵح کەریم، شێخ مارف بەرزنجی، حەسەنی قزڵجی و محەمەد مەولود، مەم، و ئەمینی میرزا کەریم و جەمال بابان)و هەندێکی‌تر لە نوسینی چیرۆکی سەرکەوتودا باڵا دەست بوون و

وەك [illegible]ەی سێیەمی مێژووی چیرۆکی کوردی تۆمار دەکرێت، لەو سەر[illegible]ەدا (عوسمان عوزێری) وەك خوێنەرو نووسەرێکی تازە پێگە[illegible]تووو چەپکێ چیرۆکی بە پێزی ناوەڕۆك پۆشتەی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی (ژین و هەتاو)دا بڵاو کردەوەو جێی سەرنجی خوێنەران بوو.

لێرەدا دەتوانین کە چیرۆکەکانی (ئەشکەنجە[1])و (ژیانی هەژاری[2])و (لە پاش باران کە پەنەك[3])ی (هاوڕێی ناپاك[4])و (کوتەکی زۆردار[5]) بە نموونەی ئاستی دەست ڕەنگینیو قەڵەم بە بڕشتی عوزێری دابنێین.

زۆربەی ناوەڕۆكو بابەتەکانی عوزێریو کرۆکی چیرۆکەکانی بریتین لە دەردە کوشندەو کاریگەرەکانی کۆمەڵی کوردەواریو ویستوویەتی لە ڕیگەیەوە کێشە کۆمەلآیەتیەکان بوروژێنێو بە چەشنی مەسەلەیەکی گرنگی ژیانی نەتەوە بەسەریان بکاتەوە.

[illegible]تی کچی قازی محەمەد:

---

[1] ئەشکەنجە، گۆڤاری هەتاو، ژ ٨٤، س ٢٢ کانونی دووەمی ١٩٥٧.

[2] ژیانی هەژاری، گۆڤاری هەتاو، ژ ٨٦، س ٢٣ کانونی دووەمی ١٩٥٧.

[3] لەپاش بارانی کەنەپەی، گۆڤاری هەتاو، ژ ٩، ١٠ی مارتی ١٩٥٧.

[4] هاوڕێی ناپاك، ڕۆژنامەی ژین، ژ ١٥٧٣، ڕۆژی ١٩٦٠/١١/٣.

[5] کوتەکی زۆردار (ئەم چیرۆکە ڕۆژی ١٩٥٧/١٠/٩ نوسراوەو لەکاتی خۆیدا بڵاونەکراوەتەوەو دواتر خراوەتە کۆتایی نامیلکەی لە پێناوی داد پەروەریا، چاپخانەی ژین، ١٩٦٠، ل ٢٧).

ناوەراستی ساڵی ١٩٥٩ بوو کاکە عوسمان مسۆدەی شانۆ نامەیەکی لە کتێبخانەی (خەبات)ی سلێمانی نیشاندام وتی ماوەیەکە لای رەقابەیەو بەڵام بەبێ رەزامەندی بۆیان ناردومەوەو ئەمجارەش سەر لە نوێ دەی نوسمەوەو هەندێ دەستکاری دەکەمو دیدەمەوە بەرەقابە، بەڵام جاری دووەمیش ماوەی چاپکردنیان نەداو لە سەریان نوسیبوو کە بابەتێکی سیاسی یەو بڵاوکردنەوەی قەدەغەیە.

ئەم مسۆدەیە تا رۆژی شەشی ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ لای من مایەوە، بەڵام لە ئێوارەی ئەو رۆژەدا داوای مسۆدەکەی کردەوەو وتی لەوەناچێ کە بتوانین دانیشین ئیتر نازانم ئەو دەستنوسە کەوتە کوێوە ئەوەی پێویستە لێرەدا بوترێ کە ئەو رۆژە مانگرتنێکی سەرتاپاگیری هەموو کوردستانی گرتەوەو دوای پێنج رۆژ یەکەم گوللەی شۆڕشی ئەیلول بەرووی حکومەتی ئەو سەردەمەدا تەقیوەو شۆڕشی رزگاریخوازی کورد دەستی پێکردو کاکە (عوسمان)یش بەشداری تێدا کردو برینداریش کرا.

کتێبی مێژوویی شۆڕشی دیار بەکر:

لیژنەی ناوچەی بەغدای پارتی دیموکراتی کورستان لە رۆژی ٢٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٠داو بە بۆنەی بیرەوەری لە سێدارە دانی (شێخ سەعیدی پیران)و هاورێ نەبەردەکانی یەوە کۆبونەوەیەکی فراوانی پێکهێناو یەکێك لە بەشدار بووەکانی ئەو کۆڕە گەورەیە خوالێخۆشبوو (عوسمان عوزێری) بوو کە تێیدا باسێکی مێژوویی سەبارەت بەو بیرەوەری یە خوێندەوەو بابەتەکە لەلایەن ئامادە بوانەوە بەو پەری خۆشیو پەسەندی یەوە وەرگیراو دەست خۆشی لە نوسەر

کرا. بەڵام پاش ماوەیەکی کەم نوسەر کەوتە خولیاو سەودای پەیدا کردنی سەرچاوەو بەڵگەی زیاترو سۆراخی بەردەوام، تا بتوانێ باسەکەی فراوانتر بکاتو لە شێوەی کتێبێکی مێژوویی‌دا بەچاپی بگەیەنێ (شۆڕشی دیاربەکر) بابەتێکی بەپێزی لە کتێبێکی خنجیلانەی ٧٤ لاپەرەیی‌دا ئامادە کردو بە پێشەکی‌یەکی مامۆستای نوسەر (محەرەم محەمەد ئەمین)ەوە خستە ژێر چاپەوەو بەم دیاری‌یە قەشەنگەی کارێکی تابلێی پیرۆزو بەهاواری راپەراند.

شۆڕشی دیاربەکر لاپەرەیەکی خویناوای‌و مەرگەساتی بزوتنەوەی نەتەوایەتی باکوری کوردستانە دژی کەمالی‌یەکانو فرتو فێڵی ئەتاتورك.

لەم نوسراوەداو بە پێی مەوداو هەلو مەرجی ئەو رۆژگارەو دەستکەوتنی سەرچاوە توانراوە کە لەسەرەتاو بنەتای شۆڕشەکەو هۆیەکانی شکستی‌و لەناو چوونو ئەنجامی بدوێو هێڵەکانی هەڵچوونو داچوونی دیاری بکاتو بە کۆمەڵێ وێنەی دانسقەوە بخاتە بەر چاوو بەمەیش کارێکی سەنگینی بەئەنجام گەیاند.

لە کاتێکدا کە ئەم کتێبەی عوزێری بڵاوکرایەوە تا ئەو رۆژگارەو ماوەیەکی دواتریش هیچ بابەتێکی سەربەخۆ سەبارەت بەم شۆڕشە مێژووی‌یە بڵاونەکرابووەوە، بۆیە هەوڵی نوسەر لەم بوارەدا دەبێتە بەرکوڵو یەکەم بەرهەمی کوردی سەبارەت بە شۆڕشی باکوری کوردستان.

لێرەدا مەبەستم لەوەنی‌یە کە ئەم بەرهەمەی عوزێری هەموو کونو قوژبنێکی شۆڕشەکەی روون کردۆتەوەو بەڵگە نادیارەکانی خستۆتە روو، بەڵام دەبێ بەپێی ئەو سەردەمەو نەبوونی سەرچاوەی پێویست

کارەکـەی نوسـەر تابڵـۆی مایـەی پەسـەندیو بەرهـەمێکی پێشـەنگی مێژوویی کوردە.

## پێشەکی:

ئەگەر ئێمە سەیری مێژووی کۆن‌و نزیك بکەین بۆمان دەرئەکەوێ کە نەتەوەی کوردمان چۆن بۆ سەربەستی خۆی‌و سەربەخۆی خاکەکەی خۆی بە پەرۆش بووەو خۆبەخت کردنی زۆر لا خۆشتر بووە لە پێناوی سەربەخۆیی‌و ئازادیدا لەوەی بە کەساسی‌و کلۆلی‌و ژێر دەستەیی بژی، هەر ئاوەهاش بە پەرۆش بووە بۆ سەربەخۆیی‌و سەربەستی گەلانی دراوسێ‌ی، بە هەموو وزەو توانایەکی‌یەوە لە کاتی تەنگ‌و چەڵەمەیان دا بە دەنگیانەوە چووەو چەکی هەڵگرتووە دژی داگیر کەرانی وڵاتانی نەتەوەکانی دراوسێ‌ی‌و چۆن لەسەر خاکەکەی خۆی خوێنی پیرۆزی خۆی رشتووە، واش لەسەر خاکی ئەوان بە هەزارەها رۆڵەی خۆی ناشتووە، ئەمە هەڵوێستی نەتەوەکەمان بووەو هەڵوێستی بەرامبەر مەسەلەی سەربەخۆیی‌و سەربەستی لە هەموو گۆشەیەکی گێتی‌دا، کە جێگای شانازی‌و سەربەرزی‌یە بۆ نەتەوەکەمان.

بەڵام داخەکەم پاداشتی ئەم چاکەیەی نەتەوەکەمان‌و ئەم دڵسۆزی‌یەی‌و ئەم دەرون پاکی‌یەی نەك هەر چاوپۆشین‌و بێ دەنگ بوون بووەو بەس لەلایەن ئەو نەتەوانەوە کە لە کاتی تەنگانەدا فریایان کەوتووەو لە دەست کۆیلەیەتی رزگاری کردوون، بەڵکو هەر کە لە تەنگ‌و چەڵەمەکەرزگاریان بووەو ئاهیان تێ گەراوەتەوە. رویان وەرگێراوەتەوە بۆ نەتەوەی کوردمان‌و لە باتی هەموو چاکەیەك بە ئاگرو ئاسن هاتونەتە وێزەی بەتەمای داگیر کردنی وڵاتەکەی‌و تواندنەوەی خۆی لەناو خوێناندا. وە نەتەوەکەمان ناچار بووە دەست بداتە چەك وە

لە پێناوی پاراستنی خۆی و خاکەکەی خۆیدا بکەوێتە شۆڕشی خوێناوی لەگەڵ ئەوانەی دوێنێ تەنیشت بە تەنیشتیانەوە لەسەر خاکەکەی ئەوان خوێنی خۆی ئەڕشت.

باشترین نمونەی سپڵەیی و ناپاکی و بێ مروەتی کە بەرامبەر نەتەوەی کورد بەجێ هێنرا بێ، کردەوەکانی حکومەتی تورکیای تۆرانی یە کە روو ڕەشی یەکە هەتا هەتا لە روخساری ئەو کار بەدەستە خوێنخۆرانە نابێتەوەو هەرگیز بە لەعنەت ئەکرێن.

پاش برانەوەی جەنگی گشتی یەکەم بە شکاندنی ئەڵمانیاو هاوپەیمانەکانی کە ئیمپراتۆریەتە شەق و شڕەکەی عوسمانلی یەکێك بوو لەوان، وە پاش ئەوەی سوپا سەر کەوتووەکانی دەوڵەتە ئیمپریالیزمی یەکان لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی تورکیای لە پەلو پۆ کەوتووی لە نوزە براویان دابوو، وە بۆ ناو جەرگەی وڵاتانی تورکیا ئەکشان و شار بە دوای شاردا لەژێر چەکمەکانیاندا ئەپلیشایەوە. ئالەم کاتە پڕ تەنگ و چەڵەمەیەدا نەتەوەی کورد لە شاخەکانی کوردستانی تورکیاوە لەژێر سەرکردەی سەرۆکەکانیا هاتنە خوارەوە بۆ ئەوەی بچن بە دەنگ مستەفا کەمال و هەڤاڵەکانی تریەوە بۆ رزگار کردنی نیشتمانی هەردووولا (هەر وەکو مستەفا کەمال هاواری کرد) لە دەست داگیرکەرو ئیمپریالیزمەکان.

نەتەوەی کوردی بە شەرەفمان، لەسەر پیشەو رەوشتە بەرزەکەی باو باپیری کە چوونە بە دەنگ زۆر لێکراوانەوە بە چەکی خۆیەوە لەریزی پێشەوەی سوپای مستەفا کەمالەوە بوو بە پێشمەرگە بۆ رزگار کردنی نیشتمان لەدەست داگیر کەرەکان، وە بە هەزارەها رۆڵەی گەلەکەمان بوو بە قۆچی قوربانی لە پێناوی سەربەخۆیی و سەربەستی

تورکیاداو خوێنی لاوی کوردو تورك لە سپێرەکاندا تێکەڵ بەیەك بوون. مەسەلەی جێبەجێ کردنی نەتەوایەتی خۆی جارێ خستەلاوە بە تەمای ئەوەی دوای دەرکردنی هێزی ئیمپریالیزمی لە خاکی نیشتمانی هەردوولا، لەلایەن تورکەکانەوە پاداشتی چاکەی ئەدرێتەوەو ئەگەر هیچ نەبێ لە سنوری دەوڵەتی تورکیادا مافە نەتەوایەتییەکانی خۆی ئەدرێتەوەو بە برایانە لەگەڵ نەتەوەی تورکدا ئەژین.

بەڵام پاداشتی نەتەوەکەمان چی بوو پاش بڕانەوەی جەنگی سەربەخۆییو سەرکەوتنی تورکە کەمالییەکان؟.. ئەو سەرکەوتنەوەی دەستیان نەئەکەوت ئەگەر یارمەتیو پشتیوانی کوردەکان نەبوایە؟؟!..

وە گەڕانەوە لە نەتەوەی کوردو بەندکردنو سزادانو لە سێدارە دانی نیشتمان پەروەرەکانی کورد بوو، کە هەموو خەتایەکیان ئەوە بوو داوایان لە مستەفا کەمالو دەستەو دایەرەکەی ئەکرد بەڵێنی خۆیان بەجێ بهێننو نەتەوەی کورد لە کوردستانی تورکیادا بەمافە نەتەوایەتییەکانی خۆی شاد بێو بە برایەتیو دۆستایەتی لەگەڵ گەلی تورکدا بژی، نەك هەر ئەمە بگرە کەمالییە فاشستییەکان دەستیان لەگەڵ دوژمنی دوێنێیاندا تێکەڵ کرد کە فەرەنسا بوو بۆلەناو بردنی کوردی دۆستی گیانی بەگیانی کە هەرە پیرۆزترین خواستی خۆی خستە ئەولاوەو بەستی بەسەرکەوتنی گەلی تورکیاوە بەسەر ئیمپریالیزمەکاندا.

ئەم هەڵوێستە پڕ شورەییەی کەمالییەکان بەرامبەر نەتەوەی قارەمانمان شتێکە لەهەموو کاتو بارێکدا ئەوەشێتەوە و وەشاوەتەوە لە هەموو چینێکی کۆنە پەرستی چەوسێنەری فاشستی کە لەسەر فەلسەفەی رەگەز پەروەری بڕوا بە رێگاوە کە بنچی فەلسەفەی تۆرانی

لەسـەر دامـەزراوە. ئـەو فەلسـەفە نابوتـە دارزیـوەی نـەك هـەر سەرنەکەوتووەو سەریش ناکەوێ بگرە زیانێکی گەورەش ئەگەیەنێ بە پێوەندی برایەتیو دۆستایەتی میانەی گەلان.

نەتەوەی کوردمان پاش ئەوەی نەك هەر بێ هیوا بوو مافەکانی خۆی دەست بکەوێ لە سایەی سێبەری حکومەتی کەمالیدا، بگرە بە کردەوە بۆی دەرکەوت کە ئەیانەوێ لەناو نەتەوەی تورکدا بیتوێننەوە، هیچ ڕێگایەکیتری بۆ نەمایەوە بۆ دەست کەوتنی مافەکانی خۆی ڕێگای شۆڕشی چەکداری نەبێ، بەم جۆرە نەتەوەکەمان لە پێناوی رزگار کردنی خۆیو کوردستانی نیشتمانیدا وەبەسەرکردایەتی پارتییە نیشتمانییەکانیو ڕۆڵە نیشتمان پەروەرە دڵسۆزەکانی دەستی دایە خەباتی شۆڕشگێڕی دژی تورانییە فاشستییەکان وە لەگەڵ ئەو چەکە پەرپوتەش کە بەدەستییەوە بوو، وەلەگەڵ ئەوەشدا کە هێزی کەمالی بە باشترین چەکی نوێ رازابوەوەو دەوڵەتە ئیمپریالیزمییەکان یارمەتیان ئەدا. ئەبینی لەگەڵ ئەوەشدا کە هێزی دوژمن لەگەڵ هێزی کوردە شۆڕشگێڕەکاندا هاوتا نەئەکرا. شۆڕشگێڕە نەبەزەکانی کورد کونە مشکیان لە سوپای تورك کرد بوو بە عەمارات، و کارێکیان پێ ئەکرد با بە دەواری شڕی نەکا. وەهەر چەندە ئەم شۆڕشانە نەگەیشتوون بە ئامانجی گەورە کە رزگارکردنی کوردو کوردستانە لە چنگی کەمالیە فاشستییەکان، بەڵام گەلێ دەست کەوتی گەورەی دەست کەوتووە کە یەکێ لەوانە بەدرۆ خستنەوەی تورکە فاشستەکانە کە ئەڵێن گوایا توانیویانە نەتەوەی کورد بتوێننەوەو کێشەی کورد لە تورکیا نەهێڵن!.

شۆڕشی (دیاربەکر) کە لە ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٢٥دا هەڵگیرسا بە سەرکردایەتی قارەمانی نەمر شێخ سەعیدی پیران‌و هاورێکانی، یەکێکە لەو زنجیرە شۆڕشانەی لە پێناوی رزگـار کردنـی کـوردو کوردستاندا هەڵگیرساوە لە دەست تورکە خوێن مژە فاشستەکان، لەم شۆڕشەدا هەر وەکو لە شۆڕشـەکانی تـردا قارەمـانێتی‌و خۆبەخت کردنی بـێ پایـانی رۆڵـەکانی نەتەوەکـەمان دەر ئەکـەوێ، لەگـەڵ ئـەو پـەڕی جـەردەیی‌و دڕندەیی‌و چەپەڵی دوژمنەکانی نەتەوەکەمان.

هەر وەکو لەم پەراوەدا ئەیخوێننەوە کە شاعیری نیشتمان پەروەری لاو بەراست‌و رەوانی‌و شێوەیەکی جوان ئەیگێڕێتەوە، بە بێ گومان ئەم کۆششەی (کـاك عوسمـان) بەتایبـەتی لـەم کاتـەدا جێگـای سوپاسـەو تەقدیری هەموو کوردێکی دڵسۆزە کـە ویستویەتی نەتەوەکەی بناسێ بـە بەشـێ لـە خەباتـە خوێناوی‌یـە کۆتـایی نەهاتووەکـەی لـە پێنـاوی سەربەخۆیی‌و سەربەستی خۆیدا بۆ ئەوەی لە قۆناغی ئێستایدا ئیلهام لــە کــردەوە قارەمانێتی‌یــەکانی بــاو باپــیری خــۆی وەرگــرێ‌و لــە تاقی‌کردنەوەکانیان سود وەرگرێ.

نەتـەوەی دلـێری کوردمـان ئەگـەر چـی هـەموو کـاتێك ئامادەیـە دەستی برایەتی‌و یارمەتی بۆ هەموو نەتەوەیەك درێژ بکات وە هەموو چاکەیـەکی ئـەوان بـە هـی خـۆی بزانـێ–هـەر وەکـو مێـژوو گەواهـە– وە سەربەسـتی‌و دیموکراتیـەت‌و ئاسـایش پـەروەرەو بەشـێکی لەیـەك دانەبڕاوی ئەزانێ، بەڵام لە هیچ کاتێکدا ئامادە نەبووەو نابێ دەستی لە مافـەکانی خـۆی بـەربدا یـا سـەر بـۆ ئەوانـە دانـەوێنێ کـە ئەیانـەوێ بیتوێننەوە. وە کۆششەکانی کەمالی‌یە تۆرانی‌یەکان‌و ئەو ماڵ وێرانی‌و سەر گەردانی‌و خوێن رشتنەی لێ ی وەشایەوە چ لە نەتەوەی کوردو چ

لە نەتەوەی تورك هەموو بەڵگەن کە سیاسەتی تواندنەوە سەری نەگرتووەو سەر ناگرێ، وە ئێمە وا چاوەڕوانمان ئەکرد کە کار بەدەستەکانی تورکیا دوای ئینقلابەکەی ژەنەراڵ کورسیل دەرس لە رابردوو وەرئەگرن و نەختێك روو ئەکەنە راستەقینەو تۆزە مافێك ئەدەن بە نەتەوەی کورد لە کوردستانی بە زۆر بە تورکیاوە بەستراو، بەڵام دیارە ئەمانیش هەر لەسەر رێ و شوێنی مستەفا کەمالی ماموستایان ئەڕۆن و لە فەلسەفە بۆگەنەکەی لانادەن و لە مێژوو دەرس وەرناگرن، بەڵام نەتەوەکەمان سورە لەسەر رێ و شوێنی شەهیدە نەمرەکانی بڕوا ئاڵای خەبات دانەنەوێنێ تەنیشت بە تەنیشت گەلی تورکەوە تا رەگ و ریشەی رژێمی تۆرانی نۆکەری ئیمپریالیزمی (ئەنگلو ئەمریکی) لە بن دەرئەهێنێ و کوردستانی نیشتمانی رزگار ئەکاو ئەگات بە هەموو مافەکانی خۆی.

زۆر سڵاو بۆ شەهیدی نەمر شێخ سەعیدی پیران سەر کردەی شۆڕشی دیار بەکری پیرۆز.

ماموستا محرم محەمەد ئەمین

سلێمانی- ١٩٦١/٣/٤.

# وتەیەك

خوێنـدەواری شـیرین ئـەم چـەند لاپەرەیـەی والەبـەر دەسـتاو ئەیخوێنیتەوە چەن دێرێکە لە مێژووی خوێناوی کوردو کوردستان.. باسی قارەمانێتی‌و نەبەزی‌و خۆبەخت کردن‌و چاو نەترساوی نەتەوە نەبەردەکەمان ئەکات.. باسـی چـەند رۆژانێکـی خوێنینـە لـە ژیـان‌و تەمەنی کوردستانی شیرینی دایکمانا. باسی ئەو رۆژە رەشانەیە کە نەتەوەی کوردی پاڵـەوانمان لـەژێر چنگـی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی خوێنخـوارو زۆرداردا بـوو.. باسـی ئـەو کارەساتانەیە کـە لـە سـاڵانی جەنگی گێتی گەورەی یەکەمدا بەسـەر خـەڵکی کوردسـتانی قارەمانـا هاتووە.. لەو رۆژانە ئەدویێ کە نەتەوەی کوردمان بە زەیی بە مستەفا کەمال ئەتاتورکا هاتەوەو بوو بە پەیژە بۆ سەرکەوتن‌و رزگار بوونی تورکیاو بێگانە دەرکردن، کەچی پاداشتی مستەفا کەمالی سپڵە ئەوە بوو بەرامبەر بە کوردو کوردستان کە لەم چەند لاپەرەیەی بەردەستا ئەیخوێنیتەوە..

وە هـەموو کوردێکی دڵسـۆزو رەوشـەن بیرو تێگەیشتوش هەست بەوە ئەکات کە پێویستە شارەزای مێژووی نەتەوەکەمان بین‌و وانـەو پەندی لێ وەرگرین‌و لـەو تاقیکردنـەوەو کردارانـەی باوباپیرمـان سـود وەرگرین. بەتایبـەتی لـەم قۆناغـەی ئـەمرۆماناو ئیتر لەمـەولا بەفشـەو بەڵێنی درۆو فرمێسك رشتنی ساختەی بێگانەو خەڵکی باوەڕ ناکەین. وە پێویستە تێکرا ئاوات‌و هیوامـان تـەنیا ئـەوەبێ بزوتنـەوەی رزگاری کوردسـتان بـەهێز بکـەین‌و ئامـانجی کوردایـەتی بکـەین بـە هـەموو مەبەستێکمان‌و تا -رزین- لە پێناویا خەبات بکەین‌و بەخت بین..

هەر ئەو هەستە پیرۆزە بوو کە پاڵی پێوەنام بۆ نوسینەوەی ئەم چەند لاپەرەیە لە شێوەی وتارێکدا. بۆ ئەوەی لەو کۆبونەوەیەدا بیخوێنمەوە کە لیژنەی ناوچەی -بەغدا-ی پارتیمان کردی بۆ بیرەوەری خنکاندنی شێخ سەعیدی پیران و هاوڕێکانی. لە رۆژی ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٦٠دا هەر دوا بەدوای ئەوە خەریکی لە چاپدانی بووم بەڵام هەندێ هۆی تایبەتی بوو بەهۆی لەچاپ نەدانی، هەرچەندە چاپ نەکردنیم بە هەل لە دەست چوون زانی (لەو کاتەدا)بەڵام ئەنجامی زۆر بە باشتر گۆڕا چونکە توانیم هەندێ سەرچاوەیتر بخوێنمەوەو زیاتر زانیاری لەبارەی (شۆڕشی دیاربەکر)و جۆری ژیانی نەتەوەکەمان لەو سەردەمەدا پەیدا بکەم‌و بیخەمە سەری.. جگە لەوەی ئەو وێنانەشم دەست کەوت کە گەلێ سود بەخشن، چونکە نەك هەر دیمەنی شوێن‌و کەسانی قارەمان‌و رووداوی شۆڕشەکەمان پیشان ئەدەن، بەڵکو یادگارێکی زۆر پیرۆزن‌و پێویستە هەرگیز پارێزگاریان بکەین.

وەهەروەها لەوەو بەر وتارەکە هەمووی بەسەر یەکەوە بوو، لەسەر پێشنیاری دڵسۆزێك بەو جۆرەی کە ئەبینین کردم بە چەند بەشێکەوە بۆ ئەوەی خوێندەوارانی خۆشەویست لە خوێندنەوەی سەرو مرِی وەرس نەبن.

وەهیوایەکی زۆر گەورەشم هەیە کە بە وردی ئەم نامیلکەیە بخوێننەوەو هەموو هەڵوێست‌و روداوەکانی بە قوڵی لێك بدەنەوەو پەندو وانەیەکی ئەو تۆی لێ وەرگرن کە جارێکیتر ئەو هەڵە گەورانە نەیەتەوە رێمان کە لەمەوپێش بەسەر بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانی نەتەوەکەمانا هاتووە.. وە کەڵك لە باوەڕ پتەوی‌و نەبەزی‌و کارامەیی‌و خۆبەخت کردنی باوباپیرمان وەرگرین‌و پەیرەوی کردەوە بەرزەکانیان

بکەین و ئەو روداوانەش کە شایانی ئەوەن سودیان لێ وەرگرین. بە شێوەیەکی زانیاریی و فراوانترو روونتر بیسەپێنین و پەیڕەوی بکەین و لەسەر ئەو رێو شوێنە بزوتنەوەی ئەمڕۆو سبەیمان بەرین بەرێوە لە پێناوی ئامانجە دورو نزیکەکانی کوردو کوردستانا..

ئیتر بۆ پێشەوە.

عوسمان عوزێری

٩٦١/٢/٧

قارەمانی مەزنی نەبەزی کوردستان
پێشەوای شۆڕشی دیاربەکر
شێخ سەعیدی پیرانی نەمر

دکتۆر فوئاد

ئەندامی کۆمیتەی سەروی کۆمەڵی ئیستقلالی کورد

# وتارەکە

خوشكو برایانی خەبات کەرو خۆشەویست

چەند رۆژێك لەمەوبەر لەم جێگایەدا کۆبوینەوە، بۆ یادو بیرەوەری چوار قارەمانە نەبەزە شەهیدەکانمان (عیزەت، خەیروڵلا، خۆشناو، قودسی) کەلە ۱۹ی حوزەیرانی ۱۹٤۷دا [٦] بە دەسیسەی کاربەدەستانی سەردەمی گۆڕ بەگۆڕی عێراق ملیان کرا بە پەتا. بەڵام گیانو بیرو باوەڕەکەیان هەر وەکو ئەوانی قۆچو قوربانی کوردو کوردستان لە مێشکی وردو درشتی ئێمەدا. لە دەرونی هەموو کوردێکی دڵسۆزدا جۆش ئەخواو بۆتە هەستو بیرو باوەڕو هیوا.

ئینجا ئەمرۆش کە ۲۸ی حوزەیرانە، یادێکی خۆشەویستی تری نەمری لە یاد نەچوویەتەوە یادمان.

یادێکی گرنگی بە نرخ سەر لەنوێ برینەکانمان ئەکولێنێتەوە.

یادێکی هەرگیزاو هەرگیز لەبیر نەچوو گوشتەو زوون بەزامە بزمەتە بەستوەکانمان یەنێتەوە.

---

[٦] لە رۆژی ۱۹ی حوزەیرانی ۱۹٦۰یشا لیژنەی ناوچەی (بەغدا) کۆبونەوەیەکی تری کرد. بۆ یادو بیرەوەری خنکاندنی چوار ئەفسەرە قارەمانەکانمان لە بارەگای پارتیمان. لەو کۆبونەوەشا وتارێکم خوێندەوە بەو بۆنە پیرۆزەوە. دوایی کرا بە عەرەبیو لە رۆژنامەی (خەبات)ی خۆشەویستی ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستانی نەبەزدا بڵاوکرایەوە لە ژمارە (۲٤٦-ساڵی دووهەم)دا.

یادێکی وا کە هەتا هەتایە مێژووی خوێناوی کوردو کوردستان لە سەر لاپەڕەی نەخشینە بە نرخەکانی ئەپارێزێو بە زیندویەتی بۆ رۆژگارو دوا رۆژ ئەهێڵێتەوەو نایەڵێت کۆن بێ...

یادی قارەمانی مەزنی دلێری خەباتکەری چاونەترساوی نەبەزی کورد (شێخ سەعیدی پیران)و هاوڕێکانی کەوا لە پێناوی رزگاری کوردستانا. لە ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٢٥دا بە دەستی کاربەدەستانی فاشیزمی چەپەڵی تورکیای تاوانکەر لە شاری (دیاربەکر)دا ملیان کرا بە پەتا.

یادی ئەو پاڵەوانە چاونەترساوانەی کە هەتا دوا هەناسەیان لە رێی رزگاری گەلە چەوساوەو نیشتمانە دابەش کراوەکەمانا بەخت بوون.

خوشكو برایانی دڵسۆزو بە نرخ زۆر شادمان بووم بەوەی بەم بۆنەیەوە ئەم هەلەمان بۆ رێك کەوت کە باسی هەڵگیرسانو کوژانەوەی ئەو شۆڕشە پیرۆزە بکەین کەوا کەم کەسمان لە چۆنێتی هەڵگیرسانو کوژانەوەی ئەزانین، چونکە کە وەکو ئیمپریالیزمو دەستو پێوەنەکانی کوردستانیان دابەش کرد، جگە لەوەی خوێندەوارێو تێگەیشتویەتیو چاوکراوەیی تەشەننەی نەسەند بوو ئیمپریالیزمیش ماوەی نەداوە بەخەڵکی هیچ بەشێکیان ئامۆشۆی یەکتر بکەنو یەك لە یەکتر بگەنو ئاگادارو شارەزای ژیانو دەرامەتی یەکتری بن..

ئینجا ئەوەی کە زۆر باو و دەرکەوتوو بێ و مێژووی نەتەوەکەمانی پێناسرابێ ئەوەیە کە لە سەرەتاوە تا ئێستا پڕە لە پەندو وانە (دەرس) وەرگرتن ئەوەش بەهۆی ئەو هەموو جۆرە زۆرداریو چەرمە

سەری‌یەوەیە کە بەسەر کوردستانەکەمانا هاتووە لەو چەرخە مێژوویانەدا کە پیایا رابردووە.

لێرەدا ماوەی ئەوەمان نی‌یە باسی هەموو ئەو روداوانە بکەین کە بەسەر نەتەوەو نیشتمانە لەت لەتەکەمانا هاتووەو گشت گۆشەیەکی مێژووەکەمان بگرین، بەڵکو تەنها بە کورتی بە بۆنەی ئەم رۆژە پیرۆزەوە (بیستو هەشتی حوزدیران) ئەو رۆژەی کە یەتە پێشەوە خەڵکی کوردستان لەلایەکەوە هەموو جۆرە زۆرداری‌و چەوسانەوەو بێ دەرامەتی‌و کە نەفتی‌و بەسەر هاتی نەتەوەکەمانیان بیر ئەکەوێتەوە. وە لەلایەکی کەشەوە ئەوەیان بۆنەبێ بە پەندو زیاتر گەرمیان ئەکات لەسەر خەباتی بێ‌وچان‌و سوور ئەبن لەسەر وەرگرتنی چارەنوس‌و ماف‌و ئامانجی خۆیان کە بە سەدان کۆرپەی جگەر گۆشەی ئەم کوردستانە لە پێناویا سەریان نایەوە. ئەڵێم بەم بۆنە پیرۆزەوە لەگەڵ بیرەوەریدا کورتە باسێکی چۆنێتی هەڵگیرسان‌و کوژانەوەی شۆڕشی دیار بەکر ئەکەین.

# کوردو دەوڵەتی عوسمانیو ڕەگەزی تورك

دەوڵەتی عوسمانی کەناوی (خەلافەتی ئیسلامیەتی) بەسەرا بڕراو هەموو نەتەوە موسڵمانەکانی کەوتە ژێر دەسەڵاتیەوە، زۆربەی ئەو نەتەوانە لە شێوەی ئەمارەتو نیمچە سەربەخۆییەکدا ئەژیان.. لە ریزی ئەو ئەمارەتە ناوخۆییانەی لە ژێر دەسەڵاتی (عوسمانی ئیسلامیەت)دا بوون گەڵێ ئەماراتی کوردیشیان تیا بووە. ئەمانیش وەك ئەوانیتر نیمچە سەربەخۆیی‌یەکیان هەبووە لەکارو باری خۆیاندا.. هەرچەند لە پێشەوە دەوڵەتی عوسمانی بە پێی (شەریعەتی ئیسلامی)و دادپەروەری لەگەڵ نەتەوە ژێر دەستەکانیا ئەجوڵایەوە، بەڵام لە ڕۆژانی دواییدا کە بگرەو بەردە لە ناوا پەیدا بوو، چاو برسێتیو تەماحیش کەوتە ناوەوە. بەرە بەرە وای لێ هات کە ڕەگەزێك بە تەنیا دەست بەسەر دەوڵەتا بکێشێو شیرازە تێك بچێت (ئەویش ڕەگەزی تورك بوو) ئیتر ئەویش کە دەستی لە دەسەڵات گیر بوو قرمی لە فراوان کردنی نەتەوەکەی خۆش کرد بەو نیازەی کەتا بۆی بکرێ نەتەوەکانیتر بتوێنێتەوەو بیانکا بە (تورك) بۆ هێنانە دی ئەم نیازە چەپەڵەش کەوتە نێو نەتەوەکانەوە بەکر مەرگەوەر ئاسایی‌یانە لە یەکی ڕاست ئەکردنەوەو ئەیکردن بەگژ یەکا.

لەسەر ئەوەشەوە کە دەوڵەتی عوسمانی لاوازو کەم دەست بوو بوو توانای ئەوەی نەبوو دەست بەسەر هەموو ئەمارەتو هەرێمەکانا بکێشێ. وە سوڵتانەکانیش لەبەر ئەوەی تەختو کەش‌و فشیان لە کیس نەچێ، دەستیان لە پیلانی لەیەك کردنی نەتەوەو عیلەکان

هەڵنەگرت بۆئەوەی لاوازو کەم دەست بن و نەپەرژێنە سەر سەربەخۆیی و یەکێتی و هەست بە هەڵویستە ناپەسەندەکانی ئەوان نەکەن.

یەکێ لەو هەریم و نەتەوانە کوردستان و کورد بوو کە لە ئەنجامی ئەم پیلانە گلاوەدا گەلێ دەردی سەری و گیرو گرفتی بەسەرا هات، ئەویش ئەوە بوو کە عیل و عەشایەرە کوردەکانیان لەناو یەکا ئەکرد بەگژ یەکاو لەیەکیان ئەکردن بە دوژمن، یەکیك لەو داردەستانەی ئەیانکردە هۆی دوژمنایەتیان جیاوازی رێی ئاین بوو. گوایە ئەم سونی یەو ئەو شیعەیەو ئەوی تر یەزیدی یەو..هتد بۆ ئەوەی بتوانن بە ئاسانی کوردستان بخەنە ژێر چەپۆکی خۆیانەوە.

وەجگە لەوەش یەکێ لە سولتانەکانی عوسمانی (سولتان عەبدولحەمید) کەوای لە خەلك گەیاندبوو خەلیفە جینشینی پیغەمبەرەو هەر کەسێ لە قسەو فەرمانی دەرچیت کافرو سەلبی سەرەمەرگ ئەبێ وەلەوە زیاتریش تەلەکەبازییەکی لە جیاوازی رێی ئایینی گەورەتر بەکارهینا بۆ لەیەك کردنی خەلکی کوردستان. چونکە خۆی باش ئەیزانی کە کوردەکان زۆر ئازاو چاو نەترسن. ئەگەر کاریکی وانەکات لەیەکیان جیابکاتەوەو بڵاوەیان پێ بکات وەیان نەیانکا بەگژ یەکا لەناو خۆیانا.. زۆر نزیکە لەوەوەی داری یاخی بوونی یەکجاری لێ بگرن بە دەستەوەو فەرمانەکانی بەهیچ نەزانن، لەبەر ئەوە سولتان عەبدولحەمید هەڵسا بە دروست کردنی لەشکریکی گەورە لە عەشایەرەکانی کوردستان لەژێر ناوی "لەشکری حەمدیە"دا، وەهەر سەرەك عەشیرەتەی روتبەیەکی پێ بەخشی و دەستەو دایەرەو خویشەکانیشی کرد بە تیپیك لە لەشکری حەمیدیە.

ئینجا بۆ ئەوەی بگاتە مەبەستە پیسەکەی روتبەی گەورەتری ئەدا بە سەرەك عەشایەریك، وە روتبەی بچوکتری ئەدا بە یەکیکی کەیان کە تۆزیك خۆی لەئەوی‌تر بە گەورەتر دەزانی،ریزی زیاتری لە یەکیکیان ئەگرت‌و ئەویتریانی ئەخستە پشت گوێ، تاکو ئەم ئالەو ساتمە بیتە هۆی رق لەیەك هەلگرتنیان‌و لەناو یەکا تیك چونیان، ودبەتایبەتیش ئەو کاتە گیانی خۆ پەرستی‌و دەسەلات بوزورگی‌و خۆدەرخستن لەناو عەشایەرەکانی کوردا زۆر بوو.. بەو جۆرە بە هۆی لەشکری حەمیدیەوە سولتان عەبدولحەمیدی جینشینی پیغەمبەر داد پەروەری بۆیە کراو.. توانی بگاتە مەبەستەکەی‌و عەشایەرەکانی کورد بە ئارەزووی خۆی بدات بە یەکاو خوینی ئەو هەموو کوردانە بکاتە گەردنی، بێ ئەوەی دلی بۆیان لی بدات بەلکو لە جیاتی بەزەیی دەستی خویناوی بەسمیل‌و ریشیا ئەهینا، وای ئەزانی بەوە دەولەتی عوسمانی‌و تەختە لە کەللە سەری کورد هەلپنراوەکەی زیاتر تەمەن دریژ ئەبێ‌و ئەو نەوەو جێنشینەکانی دوای ئەو بەسەلتەنەت‌و کەش‌و فش‌و بوزورگی فەرمان رەوای ئەکەن.. بەلام هەتا ئەهات دەولەتی عوسمانی دەردە لەرزو لاوازییەکەی زیادی ئەکردو ئەیدایە باریك‌و بنیسی‌و کەللە سەرەکانی ژیر سولتان، رزی‌و کەوتە هەرەس هینان. تاوەکو وای لی هات دەولەتی عوسمانیان ناونا (پیاوە نەخۆشەکە) کە کاتیکیش دەولەتە رۆژئاواییەکان هەستیان بەوە کرد.. هەر چاویان تێ بریوەو دانیان بۆ تیژ کرد، هەتا جەنگی گیتی یەکەم هەلگیرساو دەولەتی عوسمانیش شان بە شانی (ئەلمانیا) دژی دەولەتە سویندخوارەکان کەوتە جەنگەوە.

# کوردستان و جەنگی گیتی یەکەم

بەشی کوردستانیش بە درێژایی سالآنی جەنگ (١٩١٤-١٩١٨)ی زاینی هەر زەرەرو زیان بوو، دەوڵەتی عوسمانی بەرەش بگیری کەوتە ناو خەڵکی کوردستانەوە ئەوی بە حاڵ دەستی تفەنگی بگرتایە ئەیان گرت و رەوانەی یەکێك لەبەرەکانی[٧] جەنگیان ئەکرد، وەکو بەرەی حیجاز، یەمەن، غالچیا، چاق قەلا، فارس، ئەردەهان سارانامۆش..هتد.

ئیتر بە کورتی کورد لەکاتی شەڕا هەر پێشەنگی بەرەکانی جەنگ بووەو سنگی قەڵغان و سەنگەر بووە. وەلە پێشەوە دەستە گوڵی کوشتن لە کورد کراوە ئینجا ئەوانی‌تر، بەهیچ جۆرێك ئەو تاوانکارە نامرۆڤە دڵ بەردانە دڵیان بە کورد نەئەسوتاو وەکو بە بەشەریان نەزانن بە دەستی ئەنقەست بە گورگان خواردوویان ئەدان..

بۆ نمونە یەکێك لەبەرەکانی جەنگ کە بەرامبەر بە هێزی روسیا وەستا بوو وە بەبەرەی (فارس ئەردەهان) ناو ئەبرا، لەدوای شەڕێکی زۆر کە زانیان ناتوانن هێزی رووس بشکێنن، لەژێر سەرکردەیی ئەفسەرێکی تورکدا (ئەنوەر پاشا) (٤٠٠٠٠) چل هەزار کوردی شەڕکەریان کۆ کردەوەو ناردیانن بۆ یارمەتی ئەو بەرەیە.

ئەنوەر پاشا کە گەیشتە ئەوێ بۆی دەرکەوت ناتوانێت راستەوخۆ بچێت بەرامبەر بە هێزی روسیا رابوەستێ، چونکە هەر چل هەزار شەڕکەرەکەی ملە تفەگ زیاتر هیچ جۆرە چەکێکی تریان پێ نەبوو،

[٧] بەرە: جەبهە.

ویستی ئەو هێزە بە چیای (الله اکبر)دا هەڵگیریو لەوەیوە بچێت بەو دیواو لە پڕ هێرش بەرنە سەر هێزی روسیا..لە کاتێکا کە چلەی زستانیش بوو، وە جگە لەوەی کرێوەی ئەکرد بەفر لەپشتوێنە زیاتر لە زەویا بوو.. بێویژدانانە فەرمانی بەهەر چل هەزار کوردەکە کرد کە بە چیای (الله اکبر)دا هەگەڕێنو لەو ویوەوە بدەن بەسەر هێزی روسیاداو خۆیشی ئەچێت بۆ لای سەربازانی بەرەی (قارس'ئەردەهان)کە وان لەشەڕ کردنا، بەناچاری کە نەیان ئەتوانی فەرمانی نەك ئەفسەرێك ژەندرمەیەکیش بشکێنن، بە چیای (الله اکبر)دا هەڵگەڕان.. بەڵام سەرماو زوقمو بەفرو کرێوەو باوو بۆران نەیهێشت لە ناوەراستی چیاکە زیاتر سەرکەون، هەموویانی لەگۆ خستو بە جارێ رەق بونەوە. هەتا ئەڵین زۆربەیان کە رەق بونەوە بە تفەنگەکانیانەوە وەکو پەیکەر رەق وەستابوون. لەو چل هەزار کەسە تاقیان سەریان نەهێنایە دواوەو چل هەزار خێزانی کوردی بەسەزمانیان توشی ئاوارەییو بێکەسیو جەرگ براویو بێ دەرامەتی کرد.

ئەمە نمونەیەکی بچوکە لە کردەوە نارەواو ناشیرینەکانیان کە بەرامبەر بە کورد کردویانە، خۆ ئەوە کوشتنو بڕینو سەرەو نگون کردنیش با لەولاوە بوەستێ..

کردو نەیان هێشت کەس بێتە ناویانەوە دەستیان بەسەرا بگرێ. هەموو بڕیاریـان دا کـە هـەتا دوا کەسـیان بجـەنگن بەرامبـەر دوژمـن‌و سەردانەنەوێنن.. بەو جۆرە کورد هەر وەکو ڕۆژانی پێشووی نیمچە سەربەخۆییەکەی هەبوو لە کارو باری ناوخۆدا.

کـاتێك سـەرکەوتوانی جـەنگ ئەمـەیان زانـی‌و لـەو کاتەشـدا وری جەنگ بوون‌و نەشیان ئەویست مەرجەکانی ئاشتی بشکێنن.. ویستیان ئەوە لە کورتی ببڕنەوە لەبەر ئەوە بە پێی ڕێکەوتنێك لەگەڵ گەورەکانی کـوردا لیژنەیـەکیان دروسـت کـرد لـەژێر نـاوی (لیژنـەی پاراسـتنی شارەکانی کوردستان)[8] کەوا پێویستە شارەکانی کوردستان بپارێزرێ‌و کەس هێرشیان نەباتە سەر، وە بۆ پاراستنی ئەمەش کورد هەرچەکی خۆی دانانـێ، ئـەوانیش بـەوە قـایبل بـوون بـەو مەرجـەی کوردەکـان بەرۆکی کەس نەگرن‌و لە جێی خۆیان دانیشن.

### هەستی نەتەوایەتی

نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە دوا بەدوای کۆتایی جەنگی جیهانی یەکـەم دەوری دەوڵـەتی عوسمـانی کۆتـایی هـات.. بـەڵکو ئـەو پاشماوەیەی کە لـە پێشـەوە باسمـان کـرد لـە ئەسـتەمبوڵا مـابوو، وە دەوڵەتی سوێندخوارەکان دەستیان بەسـەرا کێشا بوو بـە (حکومـەتی ئەستەمبوڵ) ناو ئەبرا.. لە ئەنجامی ئەمەشا ئیتر ئەوە نەما کە هەموو

---

[8] تورانی‌یەکان هەرگیز دەمیان گۆناکات بڵێن کوردستان، بەڵکو هەر پێی ئەڵێن (ولایەتی شەرقیە)هەتا بەو لیژنەیەشیان ئەوت (لیژنەی پاراستنی شارەکانی ڕۆژهەلات).

## کوردستانی قارەمان

وەکاتێکیش جەنگ بڕایەوەو بە شکاندنی ئەڵمانیا کۆتایی هات دەوڵەتی عوسمانیش کە کلکی ئەڵمانیا بوو بێ دەسەڵات مایەوە.. سەرکەوتوانی جەنگ فەرەنسا، ئینگلتەرە، ئیتالیا، یۆنان (سوێند خوارەکان)لە بەرواری ١١ی تشرینی دووەمی ١٩١٨ی زایینی‌دا لە (وەرسایل) کۆبونەوەو بڕیاری وەستاندنی جەنگیان داو (مەرجەکانی ئاشتی) یان مۆر کرد.. لە دوای ئەوەش دەستیان بەسەر وڵاتانی عوسمانیا گرتو لەناو خۆیانا کردیان بە چەند پارچەیەکەوە.. وە هەر لە ئەیلولی ١٩١٨دا پاش مۆرکردنی مەرجەکانی ئاشتی، پەیمانی (مۆندوروس)یان بە دەوڵەتی عوسمانی مۆر کرد کەوا چەك دابنێو مل کەچ بێو هەرچی چەكو فیشەك هەیە لێ ی وەرگرنو سوپای عوسمانی بڵاوە پێ‌بکات.. بە ناچاری دەوڵەتی عوسمانی کە تەنیا ئەستومبوڵی بە دەستەوە مابوو، سەری بۆ بەندەکانی ئەم پەیمانە دانەواند. بەڵام سوێند خوارەکان بەوەش دەست بەرداری نەبوون لەشکریان ناردە ئەستەمبوڵو داگیریان کرد، دەوڵەتی عوسمانی ئەو تۆزەی کە مابووی هەر بەناو بوو ئەگینا کارو باری بەدەست لێپرسراوی ئەو لەشکرەوە بوو کە رژابووە ئەستەمبوڵەوە.

بەڵێ بەو جۆرە دەوڵەتی عوسمانی چەکی دابەدەستەوەو لەشکری بڵاوە پێ کرد لەسەر بڕیارەکانی (موندوروس) بەڵام کوردستانی قارەمانو گەلە نەبەزەکەی لەسەر ئەو هەموو گێرمەو کێشەشدا سەریان بۆ ئەم پەیمانە دانەنەواندو چەکیان دانەناو پارێزگاری سنوری خۆیـ

نەتەوە موسڵمانەکان لەژێر دەستی یەك دەوڵەتا بن لەباتی هەستی ئاینی هەستی نەتەوایەتی هاتە کۆڕەوە، وەهەر نەتەوەدی لە ئاستی خۆی هەوڵی ئەدا حکومەتێکی نەتەوایەتی نوێ بۆخۆی دابمەزرێنێ ئەم باوەڕەش لەناو هەموو نەتەوەکانی ژێر دەستی عوسمانیدا بڵاوبۆوەو هەوڵیان ئەدا بۆ هێنانە دی ئامانجە نەتەوایەتیەکانیان.

نەتەوەی کوردیش کە یەکێك بوو لەو نەتەوانە، هەستی بە قەوارەی‌نەتەوایەتی خۆی‌و پێویستی دامەزراندنی حکومەتێکی نەتەوایەتی سەربەخۆ کرد، بۆیە خەباتی خەڵکی کوردستان لەو چوار چێوەیە نەئەچووە دەرەوەو هەر بەوەشەوە بەسترا بۆوە، لیژنەی پاراستنی شارەکانی کوردستانیش ئەوەی زۆر باش ئەزانی‌و لێ ی روون بوو.

لەو لاشەوە تورکەکان هەستیان بە نەگەیشتنە هیواو دڵ شکاوی کرد، دەستیان ئەدا بە دەست‌و ئەژنۆدا کە دەوڵەتی عوسمانی لەژێر چنگی خۆیانا بوو، وە خەریك بوون بەهۆی ئەوەوە نەتەوەکەیان فراوان بکەن بەوەی نەتەوەکانی‌تر بتوێننەوەو بیان کەن بە تورك، کەچی ئەویش هەر قاوغەکەی ماوەتەوەو لە ئەستەومبوڵ دانراوەو سوێندخوارانی جەنگ بە ئارەزووی خۆیان هەڵمەقۆی پی ئەکەن. لەبەر ئەوە هەر چاوەڕێ‌ی ئەوە بوون‌و پەلیان ئەکوتا کە بچنەوە دۆخی جارانیان‌و نەتەوەکانیان بکەوێتەوە ژێر چەمۆڵ، سوێنحوارەکانی جەنگیش هەوای سەرکەوتوویی دابووی لە کەللەیان بە ئارەزووی خۆیان حکومەتی ئەستەمبوڵیان ئەرانی، وە هەروەها خەڵکی ئەو ناوەیان بەژێر کەوتوو سوك تەماشا ئەکردو بەداخی رۆژانی جەنگەوە تا بۆیان بکرایە ئەیان چەوساندنەوە هەتا وای لێ هاتبوو خەڵکی لەژیانی

خۆیان وەڕس بوو بوون، وە چاوەڕێی ئەوەیان ئەکرد دەستێك لەم تاریکایی‌و ناخۆشی‌یە دەریان بێنێ..

تورکەکانیش ئەوەیان بە هەل زانی بۆ هێنانە دی ئامانج‌و مەبەستەکانیان بۆ ئەوەی بە زۆر ناتوانن بە فرو فێڵ تەڵەکە بازی بگەنە ئەو پلەیە، لەژێر ناوی نیشتمان پەروەردا ئەویش ئەوە بوو کە هیچ هیوایەکیان بە حکومەتی عوسمانی نەمابوو کەوتنە خۆیان‌و خەڵکیان لە خۆیان کۆنەکردەوە بۆ رووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی‌و دامەزراندنی حکومەتێکی نوێ..

ئەو بزوتنەوەیە کە چەند ئەفسەرێکی عوسمانی ئەیان برد بەڕێوە بە تایبەتی لە (ئەنەدۆڵا)، کە کردبویان بە چەقی بزوتنەوەکەو (مستەفا کەمال) کە لەلایەن حکومەتی ئەستەمبوڵەوە کرابوو بە پشکێنەری گشتی سوپایی، لەگەڵ ئەوەشا یەکێ بوو لە لێپرسراوو بەرێوەبەرانی بزوتنەوەکە، بەو جۆرە لەرێی تورکایەتیدا تێ ئەکۆشان هەتا وای لێ هات دەوڵەتی عوسمانی ئەستەمبوڵ لە ساڵی ١٩١٩دا بەتەواوی پێ ی زانی لەبەر ئەوە فەرمانی لە سوپا دەرکردن‌و خنکاندنی چوار پێنجێك لەو ئەفسەرە تورکانەدا کەسەرکردەی ئەو بزوتنەوەیە بوون، ئەو چوار پێنج کەسەش کە دامەزرێنەری ئەو بزوتنەوەیە بوون لەبەر ئەوەی تەشەننەیان بەو بیرو باوەڕە نەسەندبوو و هەر لە دڵی خۆیان‌و چەند کەسێکی کەما بوو واتە هێشتا نەبوو بووە بزوتنەوەیەکی جەماهیری، لەبەر ئەوە کە کاتێك فەرمانی خنکاندنیشیان درا کەسیان لە پشتەوە نەبوو، یەکێ لەو ئەفسەرانە "مستەفا کەمال ئەتاتورك" بوو هەر چەند لێکیان: ایەوەو سەریان هێناو برد هیچ روناکی‌یەکی تریانن بەدی نەکرد لە کوردستان زیاتر. کە خەڵکی کوردستان ئەتوانن نەك هەر داڵدە

بەڵکو پارمەتیشیان بدەن لە هێنانە دیی ئامانجەکانیانا.. بەناچاری بەرەو کوردستان کەوتنە رێ بۆ ئەوەی بە برایەتی کوردو دراوسێیەتی لەگەڵ نەتەوەی تورکا چارێك بۆ خۆیان و بزوتنەوەکەیان بدۆزنەوە.

ئەوەی کە وەك نوێنەری سەر شانۆ دەورێکی ناپەسەندیو چەپەڵی و فێڵبازیو سپڵەیی بینیو توانی نازناوی (رێویە فێڵبازەکە) وەرگرێ (مستەفا کەمال)ی ئەفسەری دەرکراوو فەرمانی خنکاندن بەسەرا درا بوو.

بەڵێ دوای ئەوەی کە کونە مشکی لێ بوو بوو بە قەیسەریو نەیئەزانی بۆ کوێ بچێت و هیچ شوێنێکی بەدی نەکرد کوردستانی لانەی شێران نەبێ کە ئەتوانێ دڵدەی هەزارانی وەك ئەوان بدات.. بە هەر حاڵێك بوو توانی لە ئەستەمبوڵ رابکات و خۆی بخاتە پاپۆرێکەوەو بگاتە شاری (سامسۆن)، وە لەوێوە خۆی گەیاندە شاری (ئەرزرۆم). کە گەیشتە شارەکەی کوردستان ئیتر هەناسەی حەوانەوەی هەڵکێشا، چونکە ئیتر کەس ناتوانێ بە دوایا رابکات و راوەدووی بنێت.

بەو جۆرە خۆی خستە باوەشی گەلی کوردەوە، ئەو گەلەی کە بەزەیی پیا هاتەوەو گرتیە خۆی، ئەو گەلەی کە زۆر بە پەرۆشە بۆ یارمەتی دانی هەموو کەس و خەڵکێکی ئازادیخواز.. مستەفا کەمالیش کە خۆیو بزوتنەوەکەی بە نیشتمان پەروەر دائەنا، بۆیە کە گەیشتە (ئەرزرۆم)و چووە لای گەورەکانی کورد سۆزی راکێشان و لەگەڵیان رێکەوت، بە گەرماو گەرمی کۆنگرەیەکیان لە تەموزی ١٩١٩دا لە "ئەرزرۆم" بەست، مستەفا کەمال بیۆرێکی[٩] داو وتی (..ئێمە کوردو

---

[٩] یۆر: خطبة.

تورك براین، لەسەر ئەم خاکە پێکەوە خوێنمان ڕژاوە.. ئەمڕۆ هەردوولا یەك دوژمنمان هەیەو یەك زۆردار ئەمان چەوسێنێتەوە.. بۆیە پێویستە هەموومان وا هەست بکەین پێویستی‌یەکی لەوە گەورەترمان لەسەر شانە کەهەر نەتەوەمان بۆ خۆی بە جیا تێ بکۆشێ.. وە پێویستی سەر شانی ئێمە تەنیا ڕزگاری تورکیاو پێویستی سەرشانی ئێوەش تەنیا کوردستان نی‌یە بەڵکو پێویستی سەر شانی هەموو لایەکمان ڕزگاری ئەم ولاتەیە کە تورك‌و کوردو ئەرمەنی‌و نەستوری‌و گەلی کەمایەتی‌تری تیایە.. وەهەر کاتێك بە هەموومان توانیمان ئەم ولاتە لە بێگانە پاك بکەینەوە، ئەوە قسەیەك نی‌یە دووجار بیکەینەوە کوردستان ماف‌و چارەنووسی خۆی وەرئەگرێ‌و تورکیای دەستەخوشکیشی ئەکاتە ئامانج‌و کەمایەتی‌یەکانی‌تریش ژیانێکی ئاسودەو بی زۆرداری ئەبەنە سەر..).

ئەم قسە هەنگویناویانە کە لە کۆنگرەی ئەرەزرۆمدا کردی دڵی کوردەکانی بەلای خۆیا ڕاکێشاو بەتایبەتی کە کوردەکان تینوی ئازادی‌و سەربەخۆیی بوون قسەکانیان پەسەند کردو بڕیاریاندا قۆڵ بکەن بە قۆڵی (ئەتاتورك)دا لە پێناوی ئازادی‌و ڕزگاری‌و سەربەخۆی‌دا.

مستەفا کەمال بەو شێوەیەی کە خۆی بە سوپایی ئەزانی وەك (بەرگری میللی) مەشقی بە خەڵکی کوردستان ئەکردو فێری هەموو کردەوەیەکی سوپایی‌و جەنگی ئەکردن، ئەو کردەوانەو وریایی مستەفا کەمال وای لە کوردەکان کرد کە گوێ بۆ ئامۆژگاری‌و ڕێ دانانەکانی شل بکەن‌و ڕێزی لێ بگرن.

ئەتاتورك ویستی بچێت بۆ سیواس بۆئەوەی خەڵکی ئەوێش ببینێ‌و توندیان بکاتەوە، کوردەکانیش چەند لاوێکی کارامەیان خستە

تەکی بۆ پاراستنیو کە نەهێڵن بەردەستی ژەندرمەکانی عوسمانی بکەوێتەوە.

ئەوە بوو لەوکاتەدا کەلە (ئەرەزرۆم)ەوە چوو بۆ (سیوا) حکومەتی عوسمانی بەمەی زانی بوو، ژەندرمەکانی رێیان پی گرتن، بەلام کوردە چاپوکەکان لەگەلیان کەوتنە جەنگەوەو بەرەنگاری ژەندرمەکانی عوسمانی بوونو ئەتاتورکیان پاراستو رزگاریان کرد.

بەو جۆرە گەیشتە (سیواس) پاش چەند رۆژێك لە سیواسیش کۆنگرەیەکی تریان بەستو لەگەل گەورەکانی کوردا بڕیاری شۆڕشیان دا.

# سەرکەوتن و سپڵەیی

کە کاتێك ئەمان کەوتنە خۆیان بۆ جێبەجێ کردنی بەندەکانی کۆنگرەی (سیواس) لەو لاشەوە سوێندخوارەکان ( یۆنان، ئیتالیا، فەرەنسە، ئینگلتەرە)یش یارمەتی عوسمانی (حکومەتی ئەستەمبوڵ)یاندا.. بەڵام چونکە ئەمان "کوردو تورك" لە بڕوایەکی بەهێزەوە هەڵسان بە شۆڕش گوێیان نەدایەو بەرەنگاری هەموو دوژمنەکانی راوەستان.

لەم شۆڕشەدا هێزی جگەر سۆزانی نەبەزی کورد لە ناوچەی (ماردین، ئورفە، غازی عەنتەب، مەراش)دا بە جەنگی چەتەیی هێزەکانی فەرەنسەو یۆنانو ئیتالیایان چەواشە کردو شکاندیانن.. ئیتر هێزی پیاوە نەخۆشەکەش بێ دەسەڵات مایەوە، لە پاش ئەوە ئەتاتورك لە سیواسەوە لەگەڵ نوێنەرەکانی کوردستانا چوون بۆ (ئەنقەرە) لەوێ لە رۆژی ٢٣/نیسانی ١٩٢٠دا پەرلەمانێکی میللییان دامەزراند (زۆرینەی ئەندامانی پەرلەمانەکە کورد بوون) دانیان بە حکومەتی ئەستومبوڵا نەئەناو هەوڵیان ئەدا ئەو تۆزە هەناسەیەشی تیایا ماوە بی بڕنو لە شوێنی خۆیا بیتاسێنن، وە هەر لەو رۆژەشا ئەتاتورك یان هەڵبژارد بە بەرێوەبەرو سەرۆك کە کاتێك سویندخواران ئەمەیان زانیو بۆیان دەرکەوت کە بەرژەوەندیان لە لەق بونایە (پەیمانی سیڤەر)یان لە رۆژی ١١ی مایسی ١٩٢٠دا نوسیو (مسیۆ ملیران) نوێنەری وڵاتە سوێندخوارەکان بەرێوەبەرایەتی حکومەتی ئەستەمبوڵ عوسمانی مۆر

کرد کە بریتی بوون لە (فەرید پاشا، راوێژکەری وەزیران نوو) فەریق هادی پاشا سەرۆکی ئەرکانی جەنگو رەشاد خالصی بەگ، راوێژکەری دەرەوە، لە دوایدا مسیوملیران بۆ بڕیاری کۆتایی دای بەسەر (تۆفیق پاشا)دا کە سەدری عەزەم (سەرەك وەزیران) بوو پێ‌ی مۆرکرد، کە لە بەندی (٦٢، ٦٣، ٦٤)[١٠] دا مافو چارەنوسی کوردستان ئەدات..

---

[١٠] لەهەر سێ بەندەکەی پەیمانی سیڤەرا کە لە ١١ی مایسی ١٩٢٠دا مۆر کرامافی کورد بەم جۆرەی خوارەوە باس کرا:

بەندی ٦٢: لیژنەیەك پێك دێ لە (٣)سێ ئەندام لەلایەن ئینگلیزو فەرەنسەو ئیتالیاوە بۆ دانانی کوردستانێکی سەربەخۆ کە سنوری لە رۆژهەلاتی فوراتەوە دەست پێ دەکات تاکو سنوری خواروی ئەرمینیا، تاکو سنوری سوریاو میزۆپۆتامیا، وە ئەو لیژنەیە ئەوە تەرخان ئەکات کە کەمایەتی‌یەکانی ژێر دەسەلاتی حکومەتی کوردستانی داهاتوو بە تەواوی دڵنیا بن‌و لە ژێر باڵی ئاسودەیی‌و پارێزگاریان بن.

وە هەروەها ئەبێ لەو کاتەشا کوردستان لە هەموو هێرشێکی ئەرمەنی‌و ئاسوری‌و نەستوری‌و کەمایەتی‌یە ئاینی‌یەکانی‌تر بپارێزێ..

بەندی ٦٣: حکومەتی تورکیا یان ئەستەمبول هەرچی ئەو لیژنەیەی سەرەوە دانی ئەنێ کە لە بەندی (٦٢)دا باس کراوە پێویستە تا ماوەی (٣) مانگ دانی پیا بنێ‌و بەڵێنی بەجێ هێنانی ئەو بڕیارانە بدات.

بەندی ٦٤: تا ماوەی ساڵێك ئەگەر هاتوو زۆربەی کوردەکان لەو سنورەوە کە لە بەندی (٦٢)دا باس کراوە، ویستیان سەر بەخۆ بن‌و لەتورکیا جیا بنەوە، داواکەیان بدەن بە (کۆمەڵی نەتەوەکان-عصبە الامم) وە لە کاتێکا کۆمەڵی نەتەوەکان لەو باوەڕەدا بێ کە کوردەکان هەڵی ئەگرن سەربەخۆیی‌یان بدرێتێ، راسپێری ئەمە بکات بۆ جێبەجێ کردنی، تورکیا هەر لە ئێستەوە بەڵێن ئەدا بە جێبەجێ کردنی ئەو راسپێری‌یەو دانی سەربەخۆیی نەتەوەی کورد، وە واز لە هەموو مافێکی بێنێ لە کوردستانا.

هەرچەند پەیمانی سیڤەر مۆر کراو بڕیاری لەسەر درا، هیچ ڕێی لە دامەزراندنی کۆماری تورکیا نەگرت بەڵکو خێرا خێراداوای لە گەل ئەکرد کە یەك گرن‌و بجەنگن بۆ دەرکردنی بێگانە، هەتا ئەمات هێزی بەرگری‌و بزوتنەوەی ڕزگاری بەهێزتر ئەبوو، وە هەتا ئەهاتیش ئەستێرەی ئەتاتورك لە گەشترا بوو..

بەو جۆرە خەڵکی وڵات بە پیر ئەم بانگەوەو وڵات سەرکەوت. وە گەلی کورد بوو بە پەیژە بۆ ئەم سەرکەوتنە. بەوە داوای خۆی وەستێنرا کە هێشتا دوژمن لە چوار لاوە دەمی بۆ کۆمارە ساواکەیان داچەقاندووە پێویستە کوردەکان جارێ ئەم داوایە دوا بخەن هەتا تۆزێك کۆمارەکەیان خۆی ئەگرێ‌و ئەچەسپێ..

وەکو لە ساڵی ١٩٢١-١٩٢٢دا عوسمانی‌یەکان نەمان‌و پیاوە نەخۆشەکە لە حەوت ساڵان ڕاست بوەوەو ئینگلیز لە ئەستەمبوڵ کرایە دەرەوەو لە هەموو لایەکەوە دانیان نا بە کۆماری تورکیادا.. کۆماری تورکیا بە تەواوی بناغەی داڕشت‌و چەسپاو حکومەتێکی بەهێزی کۆکی لێ دەرچوو..

وردە وردە کاربەدەستانی کۆماری تورکیا ئاراستەی کارو باوەڕیان بەرامبەر بە کورد گۆڕرا. وە لە ساڵی ١٩٢٢-١٩٢٣دا بە تەواوی دەریان خست کە نەك تەنانەت مافی کورد نادات، بەڵکو هەر دانیشی پیا نانێت‌و بۆ توانەوەی هەوڵ ئەدات..

بۆ ڕاستی ئەوەشن جگە لەوەی پڕو پاگەندەی لە دژی پەیمانی سیڤەر ئەکرد کە بەندی (٦٢،٦٣،٦٤)دانی بە مافی کوردا ئەنا گوایا ئەمە هی زەمانی عوسمانی‌یەو کۆنەو بە کەڵك نایەت‌و، لەگەڵ دەوڵەتە ڕۆژئاوایی‌یەکاندا ڕێکەوت‌و پەیمانی سیڤەریان گۆڕی بە پەیمانی

(لۆزان) کە بە پێچەوانەی پەیمانی (سیڤەر)ەوە بوو، لە باتی بەرز کردنەوەی کوردو دان نان بە مافەکانیا بە ناخا ئەیبردە خوارەوەو هەرچی گەلای ئەو گوڵی هیوایەی لە باخچەی پەیمانی سیڤەرا هەبوو رویدابوو پەیمانی لۆزان وەك رەشەبا هەمووی هەڵوەران.

وە جگە لەوەش لە بەندی (٨٨)ەمی

یاسای بنچینەیی دەستوری تورکیادا ئەوە ئەخاتە روو کە هەر دان بە کوردا نانێت کە ئەڵێ: (... ئەو نەتەوانەی کە لە ژێر سایەی حکومەتی تورکیادا ئەژین، بێ گوێدانە ئایین و نەتەوایەتیان هەموو بە تورك ئەژمێررێن..).

# کۆمەڵی ئیستقلالی کورد

کە کاتێ مستەفا کەمال ئەتا تورك، لە جیاتی ئەوەی چاکەی کورد بداتەوە، ئاوا، سپڵە دەرچوو. لە باتی ئەوەی ئەوەی لەبەر چاو بوایە کە کوردەکان نەبیونایە هەر لە ساڵی ١٩١٩ەوە کرا بوو بەدارا.. بەو جۆرەی دەربارەی گەلی کورد کردو وەها چاکەی دانەوە!.. خۆی فرێ دایە باوەشی تورانییەتو شۆڤێنییەتی تورکییەوەو بێ درێخی کردن هەوڵی ئەدا بۆ تواندنەوەی نەتەوەی کورد.

کوردەکان ئەوسا ناچار بوون کەوا لەوە زیاتر سەر شۆڕ نەکەن کە حکومەتی تورکیا بە خوێنی ئەوان دامەزرابێ، ئەوان نەبونایە ناوی لە کولەکەی تەریشدا نەبوو.. لە جیاتی چاکە دانەوە بەو جۆرە دەربارەی کورد ئەکەن.. گەورەکانی کورد لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٣دا کۆبونەوەو (کۆمەڵی ئیستقلالی کورد)[11] یان دامەزراند، یەکەم ئامانجیان رزگار کردنی کوردو کوردستان بوو لەژێر چنگی ئەتاتورك‌و ژەندرمەکانی.. لە ژێر باری چەوسانەوەو کولەمەر گیرا.

---

[11] لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا کۆمەڵی تەعالی کورد بە پێشەنگی شێخ عەبدولقادری نەهری، یوسف زیا، خالد پاشای جبری، شێخ سەعیدی پیران، دکتۆر کەمال، دکتۆر فوئادو گەلێکی‌تر لە جگەر سۆزانی کورد دامەزرا بوو بە تێکەڵاو بوونی کوردەکان لەگەڵ ئەتاتورکا وازیان لێ هێنا، لە دواییدا کە ئەتاتورك بەو جۆرە سپڵە دەرچوو هەمدیسان ئەم کۆمەڵەیان پێك هێنایەوە لەژێر ناوی (کۆمەڵی ئیسقلالی کورد)دا، واتە کۆمەڵی سەربەخۆیی کورد.

لەپاش ئەوە لقیان لە هەموو لایەکی کوردستانی بە تورکیاوە بەستراودا کردەوە. وە لەبەر ئەوەی (کۆمەڵی ئیستقلالی کورد) ببێتە پارتێکی جەماهیری‌و بە تەواوی بتوانێ پێشڕەوی خەڵکی کوردستان بکات. کۆمیتەی دامەزرێنەر کۆبونەوەو بە وردی لەوە کۆڵیەوە کە چۆن (کۆمەڵی ئیستقلالی کورد) ئەگاتە ئەو رادەیەی بە تەواوی لە ناو دڵی خەڵکی کوردستانا ئەچەسپێ‌و جێگیر ئەبێ‌و ئەبێتە بڕوایەکی نەمر. لێ یان روون بوو تا ئەگاتە ئەو پلەیە چەن ساڵێکی ئەوێ. لێکیان دایەوە کە ئەتوانن بە تەواوی پاش (٣) ساڵ هەڵبسن بە شۆڕش‌و کوردستان رزگار بکەن، لەبەر ئەوە بڕیاریاندا کە لە ساڵی ١٩٢٦دا هەڵسن بە شۆڕش‌و تا دوا تنۆك خوێنیان چەك دانەنێن، یان مردن یان رزگاری کوردستان..

ئەم بڕیارە لە کۆمیتەی دامەزرێنەر (سەرو)ی کۆمەڵی ئیسقلالی کوردەوە درا.. وە لێپرسراوی لقەکانیشیان بەوە ئاگدار کردو داوایان لێ کردن کە زیاد لە پێویستی هەوڵ بدەن‌و خەبات بکەن..

بەو جۆرە (کۆمەڵی ئیسقلالی کورد) ئالای خەباتی بلوندو بەرز کردەوە، بۆ ئەوەی شەماڵی کوردستان لەسەر چیاو دۆڵ‌و دەشت‌و شارو دێهاتەکانی کوردستانا بیشەکێنێتەوە لە ژێر ئالاکەیا بەرەو رزگاری هەنگاو بنێن..

کۆمیتەی سەروو ئیتر بە هەموو جۆرێك پەلی کوتاو هەوڵی ئەدا، بۆ ئەوەی هەتا ئەو سێ ساڵە را ئەبورێ‌و کاتی شۆڕش دێت یەکێك لە دەوڵەتە گەورەکان بکات بە دۆستی کوردو لە کاتی شۆڕشدا یارمەتی بدات..

کابرایەکی گەرو کێش کە هەمیشە لەوناوەدا ئەگەڕاو خۆی بە کاربەدەستێکی ئینگلیزی نیشان ئەدا.. لە ئەنجاما توانی پەیوەندی لەگەڵ (کورسەعدی) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵایەیدا بکاتو لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ بکات.. هەتا بۆ باس کردنی ئەو مەسەلەیە بڕیاریاندا کۆبونەوەیەکی دورو درێژی دوو بە دووی بۆ بکەن. ئەو بە ناوی دەوڵەتی ئینگلیزەوە ئەمیش بەناوی (کۆمەڵی ئیسقلالی کورد)ەوە.. لەسەر ئەو بڕیارە کۆبونەوە کورسەعدیش هەرچی بڕیاری کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵ هەبوو لەگەڵ تاکتیكو نەخشەی ئەو شۆڕشەی ئەکرێو کاتی دەست پێ کردنی هەموو دا بە کابرای گەرۆك لەگەڵ گشت نهێنییەکانیا، ئەویش بەڵێنیدا بەناوی مام ئینگلیزەوە کەوا بە هەموو توانایەکیانەوە یارمەتی شۆڕشەکە بدەن، پاش ئەوەی کۆبونەوەکە کۆتایی هاتو کورسەعدی گەرایەوە، ئەویش کە گورگ بوو لە پێستی مەرا، سوكو باریك هەستا چوو بۆ لای ئەتاتورك (چونکە خۆی تورك بوو بەفێڵ خۆی کردبوو بە گەروکیکی ئینگلیزی[12] هەرچی نهێنیو ئەو زانیاریانەی لە کورسەعدی وەرگرت) تەنانەت ناوی کۆمیتەی سەرو ئەندامە دەرکەوتووەکانیشی خستە بەر دەستی مستەفا کەمال.

بەو هەڵە گەورەیەی کۆمیتەی سەرو کۆمەڵ، کاربەدەستانی حکومەتی فاشیزمی تورکیا توانیان هەموو نهێنیو نیازەکانی کۆمەڵیان دەسکەوێو تاکتیكو ڕێ ڕەوەکانیشیان لا روون بێتەوە..

---

١٢ [illegible]

ئەوەش بوو بەهۆی ئەوەی حکومەتی تورکیا زیاتر خۆی گورج بکاتەوەو لە کورد بدات، بەڵام کەزانی (کۆمەڵی ئیستقلالی کورد) لقی لە ناوچەکانی کوردستانا فریداوە، ئەیویست خەڵکی کوردستان لەخۆی بوروژێنێ لەبەر ئەوە بە بەهانە پێ گرتن لە ژێرەوە یەکە یەکە ئەو کوردانەی گیانێکی کوردایەتیان تیا بوایە ئەیگرتن‌و ئەی خستنە بەندیخانەو ژێر سزا دانەوە.. بەڵام وەك رصوی تەڵەکەباز هیچ دەستی لە کۆمیتەی سەرووی کۆمەڵی ئیستقلالی کورد نەدا، وە مەبەستیش لەوەدا ئەوە بوو کە کۆمیتەی سەروو جارێ هەست بەوە نەکات کە نهێنی‌یەکانی کۆمەڵ زانراوە، تاکو حکومەت بە پێی ئەو رێگایەی بۆ کاربەدەستانی داناوە بنکەی کۆمەڵ لاواز ئەکات‌و ئەندامە بەکەڵکەکانی ئەگرێ ئەوسا کۆمیتەکە بگرێ، چونکە سەرو لەسەر بنکە وەستاوە، کە بنکەش لاواز بوو کۆمیتەی سەرو بێ دەسەڵات ئەمێنێتەوە، یان دوور ئەرۆین بەکڵاوێك ئەگیرێ.

# چۆن شۆڕش بەرپا بوو؟

بەو جۆرەو لەسەر ئەو پیلانەی کە باسمان کرد حکومەتی ئەتاتورك دەستی کرد بە گرتن و چەوسانەوەو سزادانی خەڵکی کوردستان بەشێوەیەك لە سنوری مرۆڤایەتی دەرچوو بوو، وە لەگەڵ ئەوەشا هەر بەردەوام بوو..

لەو لاشەوە کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵی ئیستقلالی کورد ئاگای لە مەحمودی بێ زەواد نەوو، وای ئەزانی کە ئەو هێرش و خەڵك گرتنانە هەر لە زۆرداری و چەوسانەوەکەی کۆنیانە کە پاڵی نا بەمانەوە بۆ دروست کردنی "کۆمەڵێکی نهێنی" ئەمان بە باوەڕی خۆیان وایان ئەزانی هیچ جۆرە شتێك لەسەر ئەوان نی‌یەو نایان گرێتەوە، بۆیە هەمیشە بێ گوێدانە سیاسەتی حکومەت کارو باری لقەکانی کۆمەڵ و پەیوەندیان هەر وەکو جارا وابوو. وە بەباشی لە یەکتر ئاگادار بوون[١٣].

وە لەو لاشەوە هەرای (ئەستوری)یەکان دەستی پێکرد، حکومەتی تورکیاش تیپێك ژەندرمەی نارد بۆ ناوچەی (بەتلیس) کە پارێزگاری ئەو ناوە بکات. لەو تیپەدا هەندێ ئەفسەری کوردیشی تیا بوو، یەکێك لەو ئەفسەرانە (یوسف زیا)ی خەباتکەر بوو. بۆ ئاگاداری بروسکەیەکی

---

[١٣] کارگێرانی کۆمیتەی سەروی کۆمەڵ کە بریتی بوون لە (شێخ عەبدولقادری نەهری، کورسەعدی، حاجی ئەختی محامی، دکتۆر کەمال، دکتۆر فوئاد، محەمەدی کوڕی شێخ عەبدولقادر، خوجە عەسکەر) لە ئەستەمبوڵ دانیشتبوون بۆ بەڕێوە بردنی کارو باری کۆمەڵ.

بۆ (ڕەزا)ی بـرای لێ دا لـە (ئـەرەزرۆم) کـەوا ئەسـتوریەکان لـەوێ هەڵساونو مانیان گرتووە..

کە کاتێك "ڕەزا زیا"ی برای "یوسف زیـا" ئـەم بروسـکەیەی لـە براکەیـەوە وەرئـەگرێ بـەجۆرێکیتر ئەمـە لێـك ئەداتـەوە. وە پیشـانی کوردە دڵسۆزەکانیدا. هـەموو بە هەڵەدا چوونو وایان زانی کە ئەمـە مەبەستێکی شاراوەی تیایەو مەبەستی یوسف زیا ئەوەیە کە ئەڵێ وا ئێمـە لـێرە هەڵسـاوین ئێـوەش دەسـت پـێ بکـەن، ئـەوە بـوو بـەو هەڵەشەیییە کەوتنە خۆیان، بەڵام حکومەتی ئەتاتورك پـێی زانینو بە گەرماو گەرمی (خالد پاشای جیری)[14] لە ئەرەزرۆمو (حاجی موسا) لە موشو ڕەزا زیاش لە ئەرەزرۆم گرتو خستیانە بەندیخانەوەو لە پاشا یوسف زیاشیان لە بەتلیس گرتو هـەموویان هێنـان بـۆ گرتوخانـەی بـەتلیس، لـەوێ هـەموویان ڕیـز کـردنو دایاننـە بـەر دەسـت ڕێـژو کوشتیانن.

---

[14] خالد پاشای جیری: بە قارەمانێکی جگەر سۆزی خزمەت گوزاری کوردستان ئەژمێرێو هەتا هەتایە کوردایەتی شانازی پێوە ئەکاتو کوردەواری بە یەکێ لە پێشەواکانی بزوتنەوەی رزگاری کوردستانی (کوردایەتی)ی ئەداتە پێنوس.

-خالد پاشای جیری، لە قوتابخانەی جەنگاوەری ئەستەمبوڵ لە لقی عەشایەری دەرچووەو لـە لەشـکری (حەمیدیـە)و جـەنگی گشـتی (حربـی عومـی) میـر ئـالا "کولونیل"ی سوپایی بوو.

لەپاش موتارەکە (کۆتایی جەنگی گێتی یەکەم) لە ئەرەزرۆم. کرا بە موچە خۆر (موظف) هـەر لەوێ ژیا تا کاتێ لـە ئـەنجامی بـە هەڵـە لێکدانـەوەی بروسـکەکەی (یوسف زیا) گیراو لەگەڵ کوردە گیراوەکانی تردا نێرا ۆ گرتووخانەی بتلیسو بەو جۆرە شەهید کرا.

لە پاش کوشتنی ئەوان ژەندرمە بە کرێ گیراوەکانی ئەتاتورك ویستیان شێخ سەعیدی پیران لە (خەنس) پاشای حەسەنان لە مەلازگوردو نوح بەگ لە موش بگرن، لە کاتێکا (نوح بەگ)یان گرت، خالد حەسانان بەوەی زانی هێرشی بردە سەر ژەندرمەکانی ئەتاتورك‌و نوح بیگی رزگار کردو یاخی بوون.

شێخ سەعیدیش کە ئەو کاتە تەمەنی ئەچووە (٦٠)ساڵ داوایان کرد، کە بچێت بۆ لای کار بەدەستانی لە (بەتلیس) ئەویش لەوە گەیشت کە لە گرتن‌و سزادان بەو لاوە هیچی‌تر نی‌یە، بە لێ بووردنەوە پێی وتن کەوا پیری‌یەتی تاقەت‌و توانای نەهێشتووەو ناتوانێ بچێت..

لەبەر ئەوە لە گێرمەو کێشەی ژەندرمەکان خۆی رزگار بکات هەڵسا لە (خەنس)ەوە، چوو بۆ دێی "پیران" بۆ ماڵی "شێخ عەبدولرەحیم"ی برای، بەڵام حکومەتی تورکیا وازی لێ نەهێنا، یەك دوو ئەفسەر چەند ژەندرمەیەکیان بە دوادا نارد بۆ پیران، ئەویش هەر سەرپێچی کردو نەچوو، بەڵام ئەفسەرەکان هەر وازیان لێ نەهێناو بەهانەیان پێ ئەگرت، هەتا گەلێ کردەوەی ناشیرینیان نواند بەرامبەر بە شێخ سەعید، شێخ سەعیدیش لە سەرێکەوە کە کوردەکانی کوردستانی تورکیا هەموو رێزیان لێ ئەگرت‌و لەسەر ئەوەشەوە بە راوێژکەرێکی ئایینی‌یان ئەدایە پێنوس‌و زۆر لە دڵیانا خۆشەویست ببوو. هەرچەندە خۆی تۆزێ دانی بە خۆیا گرت بەرامبەر بەو کردەوە ناشیرینانەی ژەندرمەکانی ئەتاتورك نواندیان، بەڵام کەس‌و کاری‌و ئەو کوردانەی لەوێ بوون ئەمەیان بۆ هەڵنەگیراو نەیان توانی دان بەخۆیانا بگرن، زۆربەی رق‌و قینیان لە ژەندرمەکان نەبووەو لە سەرێکی کەشەوە داخی شەهیدەکانی بەتلیس‌و ئەو کوردانەی گیرا بوون لەسەر دڵیانا خڕ بوو بوو، بۆیە ئەفسەرو

ژەندرمەکانیان دایە بەر دەست ڕێژو شیلکی تفەنگ‌و کوشتیانن.. ئیتر بەو جۆرە کوردەکان ناچار بوون کە لەسەر خۆیان‌و نیشتمانە کەیان بکەنەوە، چونکە لەوە زیاتر خۆیان بۆ ڕانەگیرا.. لە ڕۆژی ٨ی شوباتی ١٩٢٥ەوە دەست کرا بە شۆڕش[١٥] شێخ سەعید ناردی بە دوای پیاوە گەورەکانی کورداو شۆڕشەکەیان کرد بە چەند بەرەیەکەوە، بە مەرجێ هەر بەرەی بە دەست یەکێکیانەوە بێو بێ ترس بجەنگێ لە ڕێی مافی کوردو چارەنووسی کوردستانا.

بە ١٠-١٥ ڕۆژ شۆڕشگێڕەکان توانیان لە بەرەی (خالد پاشای حەسەنان)ەوە ناوچەی وارتوو، مووش، خەنس، بەتلیس داگیر بکەن‌و مل بنێن ڕووەو ئەرەزرۆم.

وە لەبەرەی (شێخ شەریف)ەوە "مەلەکان، پینگۆل، پالۆ، گەنج، ئەلعەزیز، داراهینی، خەربوت" یان داگیر کردو روویان کردە (سیواس).

شێخ سەعید خۆیشی هەر لە پیرانەوە بە هەرچی قەزاو ناحیەی دیاربەکرەوە هەیە هەمووی داگیرکردو ئەیوست بچێتە ناو شاری (دیار بەکر)ەوە..بۆ ئەنجام شێخ سەعید توانی بگاتە شاری دیار بەکرو داگیری بکات.. وە ئالای کوردستانی لەسەر قەلای دیاربەکر هەڵ بکات..

حکومەتی تورکیاش کە زانی ناتوانێت ڕق‌و سەرگەرمی‌و خۆ بەخت کردنی شۆڕشگێڕەکانی کورد بکوژێنێتەوە، هەر بە گەرماو گەرمی کارگیرانی کۆمیتەی سەروی (کۆمەڵی ئیسقلالی کورد)ی گرت کە

[١٥] لە ٤ی مارتی ١٩٢٥دا شێخ سەعید بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە لە کۆتایی ئەم نامیلکەیەدا بیخوێنەرەوە.

لە ئەستەمبول دائەنیشتن، وە خستی‌یە بەندیخانەوە.. وە هەروەها کە زانی تازە شۆڕشگێڕەکانی کورد کوردستانیان داگیر کردووەو هیچ چاری نەماوە، وەهەستی بەوە کرد ئەگەر زوو فریای خۆی نەکەوێ شوێن بەخۆیشی لەق ئەبێ.. بە پەلە پروزێ هاواری بردە بەر حکومەتی فەرەنسە کە ئەوکاتە سوریای لەژێر دەستا بوو، بەڵی پاڕانەوەو داوای لێ کرد کەوا رێی بدات بەهۆی خەتی شەمەندەفەری سەر سنوری حکومەتی تورکیاو سوریاوە، لە "ئەنقەر"ەوە هێزو سوپا بنێرێ بۆئەوەی لە دواوە ئەو شوێنانە داگیر بکاتەوە کە شۆڕشگێڕەکان داگیریان کردووەو بەسەریا تێ پەڕ بوون. بۆئەوەی ئەم شۆڕشە بکوژێنێتەوە کە تورکیای خستۆتە گێژاوی وری‌یەوە.

فەرەنسای ئیمپریالیزمی چەپەڵیش کە دوژمنی گەلانی ئازادی خوازە، بەمە قایل بوو، وە بە ئارەزووی ئەتاتورک رێی بۆ هێزی تورکیا کردەوە کە بە خەتی شەمەنەفەری سەر سنورا بێن و لە دواوە لە ناکاو بدەن بەسەر شۆڕشگێڕەکانی کوردا.. لە کاتێکدا لەو لاوە شۆڕشگێڕەکان شەڕیان لەگەڵ ئەو هێزە ئەکرد کە بەرامبەر "دیاربەکر" وەستا بوو، لەناکاو لە دواوە ئەو هێزە گەورەی بەهۆی خەتی شەمەنەفەرەوە هات دایان بەسەریانا، ئەو کاتە شێخ سەعیدو شۆڕشگێڕان کەوتنە نێوانی دوو ئاگرەوە. لە هەموو لایەکەوە هێزی تورکیا گەمارۆی شۆڕشگێڕەکانی کوردیان دا، لەپاش ئەوەی شەڕێکی زۆریان کرد. شۆڕشگێڕەکان نەیان توانی دەرەقەتی ئەو هێزە گەورەیەی تورك بێن کە هەر چوار لایان لێ تەنێ بوون، هەر چۆنێ بوو بە شەڕ لایەکیان در پێداو دیار بەکریان بەجێ هێشت و گەرانەوە بۆ (وارتۆ).

# حەزاو زۆرداری

لـە دوای شـکاندنی شۆڕشـگێرەکان و گەڕانـەوەیان بـۆ "وارتـۆ" ژەندرمەکانی تورك هەرچی دێیەکیان بهاتایە بەردەم ئەیان سوتان و پیاوو ژن و کچ و پیرەمێردو پیرێژن و منالی ساوایان ئەکوشت، یان هەر لە خانوەکانیانا ئەیان سوتاندن.. وە لەوە خراپ تریش جگە لەوەی لە سنوری مرقایەتیان کردبووە دەرەوە. هێرشیان ئەبردە سەر ناموسی ئافرەتـە بەشـەرەفەکانی کوردسـتان، هـەتا زۆر لـەو ئافرەتانـە لەبـەر ناموس و حەیای خۆیـان هیچ دالدەیەکیان نەئەما، بۆ ئەوەی نەکەونـە دەست ژەندرمە بێ فەرە تاوانکارەکان ئەچونە سەر لوتکەی چیاکان، پێش ئـەوەی دەسـتی ژەندرمـەکانیان بگاتـێ خۆیـان فـڕێ ئەدایـە خـوارەوەو خۆیـان ئەکوشـت، وە جگـە لـەوەش ئـەو ژەندرمـە بـێ بەزەییانە.. ئەو ویژدان تۆپاوانە، تەنانەت منالی یەك دوو سالان و سەر بێشکەشـیان تـوش بوایـە کـە هێشـتا ئاگـای هیچیـان نـە ئـەزانی و ئەشنانەوەو دەمیان بە زەردەخەنەو پێکەنینەوە بوو، هەلیان ئەدان بە ئاسماناو نیزەکانیان ئەدایە بەر پشتیان لە کاتی کەوتنە خوارەوەیاندا نوکی نیزەکانیـان لـە پشـت یـان سـکیانەوە دەرئـەچوو. کـە ئـەشمردن هێشتا لێویان هێلی زەردەخەنەو شنانەوەکەیانی لەسەر کێشرا بوو.. بـەو جـۆرە هەلمـەقۆیان بـە منالـە سـاواکانی کـورد ئـەکرد بـە نوکـی نیزەگلاوە تاوان کارەکانیان کە بە خوێنی خەلکی کوردستان توێژالی سووری گرتبوو..

ئیتر بەو جۆرە توشی هەر دێیەك، هەر شارێك بوونایە گیانداریان لێ ئەبڕی و قڕیان تێئەخست، بەو شێوە نامرۆییە حکومەتی تورکیای

تاوانکاری نۆکەری ئیمپریالیزم ئەو کردەوە نارەواو نالەبارانەی ئەنواند بەرامبەر بە گەلی کورد. لەگەڵ ئەوەشا مرۆڤایەتی‌و گەلانی سەر رووی جیهان کە بە چاوی خۆیان ئەیان دی‌و بە گوێی خۆیان ئەیان بیست‌و هەواڵی گەلی کوردیان ئەزانی، چاویان لە ئاستیا ئەنوقان‌و رووی خۆیان لەو باسە وەرئەگێراو گوێی خۆیان لێ کەڕ کردبوو، وە ئەوەیان پەلەیەکی رەشی گەورەیە بە ناوچەوانی گەلانەوە، بەرووی ئاوێنەی خەباتی بزوتنەوەی رزگاری نەتەوەکانی سەر رووی زەمینەوە. لام وایەو دڵنیاشم هەڵە نیم‌و قسەکەم راستە، چونکە مرۆڤایەتی "وەکو ئەڵێن" هەمووی یەك زنجیرەیەو هەر نەتەوەیەك لەسەر زەویا ئەڵقەیەکە لەو زنجیرەیەوە بەهەموویان ئەو زنجیرەی مرۆڤایەتیان پێك هێناوە، مانای ئەوەیە ئەگەر مرۆڤێك لەبەر چاوی یەکێکی تریان بکوژرێت، یان کۆرپەکانی نەتەوەیەك لە بەردەمی خۆیانا بەبەر چاوەیانەوە زۆردارێك شەلم کوێرم ناپارێزمانە قریان تێ بخاو لەناویان بەرێ‌و بیان کوژێ، پێویستە هەر هیچ نەبێ دڵیان پێی ناخۆش بێ‌و بەلای کەمەوە ناوچەوانیان لوچ‌و گرژی‌یەکی پێ ناخۆش بوون‌و بەزەیی تێ کەوێ، بە تایبەتی گەلی کوردیش کە ئەڵقەیەك بێ لەو زنجیرەیەو بە بەرچاوی مرۆڤایەتی‌یەوە وای بەسەر بێ‌و کەسێك یان نەتەوەیەك نەبێ‌تەنانەت پێ ناخۆش بونی خۆیشی دەربرێ، بە راستی ئەگەر بیری لێ بکەینەوە زۆر جێی داخ‌و ئەفسوسە لە کاتێکا ناوی خەباتی گەلان‌و مرۆڤایەتی یەنن‌و نەتەوەکەشمان وای بەسەر هاتبێ.. بۆیە بە گوستاخانەوە ئەو هێرشە رەواو راستە ئەبەمە سەر مرۆڤایەتی لەو کاتەداو لە بارەی ئەو باس‌و رووداوەوە.

# شۆڕشەکە چۆن کوژایەوە؟!

شێخ سەعیدیش بۆی دەرکەوت ئەگەر وا بڕوات هەتا بێت شۆڕشەکە رووەو کپ بوون ئەڕوات، وە لەگەڵ ئەوەشا هیچ کەسێك پشتیان ناگرێو بەزەیی پیایانا نایەتەوەو لەسەریان نایەتە گوفتار، ویستی بچێ بۆ کوردستانی ئێرانو لەگەڵ کوردەکانی ئەوێشدا رێك بکەوێت بۆ ئەوەی ئەوانیش یارمەتی شۆڕشەکە بدەنو کوردستان لەدەست ئەو زۆرداریو چەوسانەوە رزگار بکەن.

سەرۆکی بەرەکانی شۆڕشی کۆکردەوەو ئەوەی بۆ دەرخستنو ئەو تەگبیرو نیازەی خستە بەردەستیان. ئەوانیش هەموو پەسەندیان کردو لەپاشا بۆ هەموو شۆڕشگێرەکانیان دەرخستو تێیان گەیاندن نیازیان چی‌یە، هەروەها ئەوانیش پەسەندیان کردو خۆیان ئامادە کرد.

شێخ سەعیدو سەرۆکی بەرەکانی شۆڕش بڕیاریان دا کە لە (پردی ئەورەحمان پاشا)وە بپەڕنەوە بۆ بەری ئێرانی "کە ئەکەوێتە نێوانی چیای شەرافەدینەوە".

بەڵام لەو کاتەدا کە شێخ سەعید ئەم تەگبیرەی بۆ شۆڕشگێڕان ئەکرد نەیزانی کە وا (قاسم بەگ جبری)[16] کە یەکێ بوو لەوانەی لەسەر

[16] لەکاتی خۆیا قایمقامی (خەنس)بوو، خۆی بە کورد پەروەر دائەنا کە لەگەڵ شێخ سەعیدا ئەدواو بە دەم خۆی بەخت ئەکرد لە رێی کوردستانا تاکو شێخ سەعید بڕوای پێ کردو لەکاتی شۆڕشدا تەرخەمێکی زۆری نەدایەو شۆڕشگێڕانیش زۆر رێزیان لێ ئەگرت، ئەویش هەر لە پێش شۆڕشەوە پەیمانی لەگەڵ ئەتاتورکا بەستبوو کە یارمەتی بدات بۆ توانەوەی کوردو کوردایەتی.

زارى خۆى بە دڵسۆزى كوردو بزوتنەوەى رزگارى كوردستان (كوردايەتى) ئەزانىو فرمێسكى بۆ كورد ئەڕشت، لە يەكەم بزوتنەوەو هەڵگيرسانى شۆڕشەوە هەموو تەگبيرو ئامانجێكيانى لە ژێرەوە داوە بە حكومەتى توركيا، -ئەويش حكومەتى توركيا- بە هەموو هيزێكىيەوە هەوڵى داوە كە تێكڕا تەگبيرو هەنگاوەكانى شۆڕش تێك بداو نەهێڵێت بگاتە ئامانجو بكوژێتەوە..

ئينجا شێخ سەعيد بەوەى نەئەزانى كە زۆربەى بەسەرهاتى ئەو چەڵەمانەى كە ئەهاتنە رێى شۆڕش لە ناپاكىو خيانەتى (قاسم جبرى) ناپاك بووە.

ئينجا ئەو رۆژەش كە شێخ سەعيد نيازى وابوو بچێت بۆ ئێران، قاسم جبرى لە ژێرەوە لە جاسوسيەتى خۆى دوانەكەوتو ئاگادارى كاربەدەستانى حكومەتى ئەتاتوركى كرد، حكومەتى توركياش هەرچى هێزى هەبوو ئەمبەرەو بەرى رێگاكەو پردەكەيان گرت كە وەكو وتمان ئەكەوێتە دۆڵێكى چياى شەرافەدينەوە.

كە كاتێك شۆڕشگێرەكان ئەرۆيشتنو گەيشتنە ئەوەى لە پردى (ئەورەحمان پاشا) بپەڕنەوە، نەيان زانى كەوا لەسەر تەگبيرى (قاسم جبرى) ناپاك هێزى توركياى چەپەڵ ئاگادارەو ئەم لاو لاى پردەكەى گرتووە، كە ئەمان گەيشتنە ناوەراستى پردەكە، كاتێكيان زانى دەست رێژيان لێ كرا، شۆڕشگێرەكانيش هيچيان بۆ نەمايەوە بەهەر حاڵو بەرهەڵستىيەك بوو خۆيان گەياندەوە سەرى پردەكەو كەوتنە شەڕ لەگەڵيانا، كە لە نێوانى هەردوولادا بوو بە تەقە، هەركە چەند كەسێك شەهيد كران (قاسم جبرى) چەپەڵ ويستى بڕواو ئيمانى شۆڕشگێرەكان بێ هێز بكاتو بيان خاتە شكو دوو دڵىيەوە.. بۆيە خێرا خێرا پێى

ئەوتن (تازە ئێمە شەڕمان بۆ ناکرێ، ئەوان زۆرن‌و ئێمە کەمین.. با خۆمان بدەین بەدەستەوە..) پەیتا پەیتا ئەم قسانەی ئەدا بە گوێی شۆڕشگێڕەکانا. کەزانی بەقسە دەست لە شەڕ هەڵناگرن‌و هەر ئەجەنگن، هەڵسایە سەر پێ‌و ئالای سپی هەڵگرت بە مانای ئەوەی شکان‌و خۆیان دابەدەستەوە.. کە شۆڕشگێڕەکانیش ئەمەیان دیی، کە قاسم جبری لە سەرێکەوە خۆی لە هەموویان بە زیاتر ئەزانی‌و ئەوانیش وەك لەسەر زاری خۆی بە دڵسۆز ئەزانی، بە دڵسۆزیان ئەزانی.. ئەوە بوو بووە هۆی ئەوەی هەموویان هەڵسان‌و چەکیان فڕێداو دەستی خۆدانە بەدەستەوەیان هەڵبڕی.. هەر چەند شێخ سەعید هاواری کردو بانگی کردن بێ سوود بوو، تازە کار لەکار ترازا..

ژەندرمەکانیش خێرا هاتن دەست بەجێ شۆڕشگێڕەکانیان باڵ بەست کردو بە شێخ سەعیدەوە دایاننە پێش.

بەو جۆرە لە ٢٤ی نیسانی ١٩٢٥دا، شۆڕشە مەزنەکەی دیاربەکر کوژایەوەو شۆڕشگێران لە ئەنجامی خیانەت‌و ناپاکی قاسم بەگ جبریدا گیران‌و خرانە گرتوخانەو زیندانەوە.

# بەشی هەموو ناپاکێك[٢]

لەپاش ئەوەی شێخ سەعیدو شۆڕشگێڕان بەند کران (قاسم جبری) ناهەموارو ناپاك چوو بۆ لای ئەتاتورك؛ کرنوشی بۆ بردو پێی وت (.. حەزرەتان بەڵێنتان دابوو کەوا هەر کەسێك سەر بە حکومەتی تورکیا ... ەوڵ بدات شۆڕشی دیاربەکر بکوژێنێتەوەو دژی کوردەکان بێ و یارمەتیشیان بدات. پاداشتی بەنرخی ئەدەنەوە جگە لەماڵو موڵكو زەوی و زارو خانوو بەرەو موچەیەکی باش، وە خۆتان ئەزانن من هەر لە مێژەوە لە گەڵتانمو یەکەم کەس بووم کە کۆسپی گەورەم بە شۆڕش و بزوتنەوەی کوردەکان دروست ئەکرد، وە هەروەها منیش بووم توانیم شۆڕشی دیار بەکر بکوژێنمەوە بە یارمەتی یە گەورە گەورەکانم وەکو جەنابت ... ئێستاش بۆ ئەوە هاتوومەتە خزمەتتان..).

بەڵام، وەڵامو پاداشتەکەی ئەتاتورك بۆ قاسم جبری ناپاك دەرکردنو قسەی ناشیرین بوو، وە پێی وت (تۆ بۆگەنەکەی خۆت بە کەڵك نەهاتی ئێستا ... بۆ ئێمە ئەکەیت.. چاك تر وایە پێش ئەوەی سزات بدەمو تاوا... رت بکەم، چونکە تۆش هەر لەگەڵ شۆڕشگێڕەکانا بویت برۆ دەرەوە.. دەی..) ئەویش بێ نابڕوانە کە چارەنوسی هەموو ناپاکێکە ئێستا بە سەرشۆڕی لە (وارتۆ) ئەژی.. بەڵام گەلی کورد هەر بە گڵاوەی ئەزانێتو بێ بەری یە لە هەموو ئەو کەسانەی خۆیان بە کورد ئەزانن و ناپاکی لە ئامانجو مەسەلەی کوردو بزوتنەوەی رزگاری کوردستان ئەکەن.

# خنکاندنی قارەمانانی شۆڕش

ئینجا بێینەوە سەر جۆری خنکاندنی قارەمانەکانمان.. کە کاتێ شۆڕشگێڕەکان لە ٢٤ی نیسانی ١٩٢٥دا گیران، کۆمیتەی سەرووی ئیسقلالی کوردیش کە لەوەو بەر گیرا بوو لە ٢٤ی مایسی ١٩٢٥دا فەرمانی خنکانیان دەرچوو، بە دامەزراندنی کۆمەڵی ئیستقلالی کورد تاوانبار کران، تاکو ٢٧ی مایس لە بەندیخانەدا هێشتیانەوە بۆ سزادانو جۆرەها ئەشکەنجە، بەو پێیە بێ ویژدانانەی خۆیان سزایان ئەدا.. لە رۆژی ٢٧ی مایسی ١٩٢٥دا، هەر حەوت کارگێڕەکەی رەها کۆمیتەی سەرووی (کۆمەڵی ئیستقلالی کورد) "شێخ عەبدولقادری نەهری، دکتۆر کەمال فەوزی، دکتۆر فوئاد، شێخ محەمەد، شێخ عەبدولقادر، کورسەعدی، حاجی ئەختی محامی، خوجە عەسکەری" لە دیاربەکر لە سێدارە دران، وە هەندێکی کەیان لەگەڵ شێخ عەبدولقادرا مەحاکەمە کران، بڕیارەکانیان دوا خست بۆئەوەی لەگەڵ شێخ سەعیدا مەحکەمەیان بکەن، ئەوە بوو رۆژێك پێش خنکاندنی شێخ عەبدولقادرو هاوڕێکانی واتە لە ٢٦/مایسی ١٩٢٥دا دەستیان کرد بە مەحکەمە کردنی شێخ سەعیدو هاوڕێکانیو لە ئەنجامدا تاوانباریان کردن بە دامەزراندنی حکومەتی کوردستانو جیابونەوەو بوونە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشەکە، بەو جۆرە محاکەمەیان هەتا مانگێکی خایان، لە پاشا لە رۆژی ٢٧ی حوزەیرانی ١٩٢٥دا بڕیارەکانی مەحکەمەیان خوێندەوە کە بە شێخ سەعیدەوە (١٠٣) کەسیان فەرمانی خنکاندنی درا بەسەراو ئەوانی تریش لە (٢٠) ساڵییەوە تا بەندی هەتا هەتایی

بیان گرە، ئەو مەحکەمە چەپەڵە کە ناوی خۆی نابوو (مەحکەمەی ئیستقلال) فەرمانی نارەوای بەسەرا دان، ئەو (١٠٣)کەسەی کە فەرمانی خنکاندنیان درا بەسەرا (٤٧)یان لەسەر کردەو پیاوە گەورەکانی کورد بوون‌و (٥٦)کەسەکەی تریشیان لە لاوە دەرکەوتووە چاپوکە جگەر سۆرەکانی کورد بوون.

لە شەوی ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٢٥دا، مانگەشەوێکی تریفەداری زۆر خۆش بوو لە سەعات ١٢ی شەوی زەوا، دەستگای مەحکەمەی ئیستقلالی چەپەڵی تورکی هەر (١٠٣)یان دانە پێش بۆ سەر ئەو ریزە قەنارەیەی کە لەسەر شورەی (دیاربەکر) بۆیان هەڵخستبوون، لە کاتی لە سێدارە دانیشیانا وەستا بوون بە دیاریانەوە. ئەو سەرکردە کوردانەی لە سێدارە دران‌و بە تەواوی ناسرابن ئەمە هەندێکیانە کە توانیمان ناویان بزانین (شێخ سەعیدی پیران، شێخ شەریف، شێخ عەبدوڵلای مەلەکان، کامل بەگ، بابان بەگ، شێخ شمسەدین، رەشید بەگ، تەیمور بەگ، رەئیس بەحری، مەقسود بەگ، عەلی بەگ، حسێن بەگ، مەلا جەمیل، نوح بەگ، یوسف بەگ‌و.ز لەگەڵ ئەوانی تریشدا)[17].

شێخ سەعیدیان لەولاوە راگرت‌و ئەوانیان یەکە یەکە ئەبردە سەر سێدارەو هەڵیان ئەواسین، بەڵام هیچ کامیان لۆچی گرژی‌و پێ‌ناخۆش

---

[17] زۆر کەس لە سێدارە دانی شێخ سەعیدی پیران‌و هاورێکانی لە بەرواری ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٢٥ دائەنێ، رەنگە وای دابنێین کە گوایە لە سەعات (١٢)ی نیوەشەو بەو لاوە لەسەر ٢٩ حوزەیرانە، بەڵام هەموو کوردەکانی تورکیا ٢٨ی حوزەیران دائەنێن بە لە سێدارەدانیان، چونکە لە پێش سەعات ١٢دا بردویانن بۆ سەر سێدارەو لە سەعات (١٢)دا دەستیان کردووە بە خنکانیان، لەبەر ئەوە راستی بەرواری خنکاندنیان ئەبێ ٢٨ی حوزەیران دابنێن بەیادکردنەوەیان.

بوونــی نەئەکەوتــە ناوچــەوان، بــەڵکو بەروویــەکی خــۆش‌و (بــژی کوردستان)ەوە پەتەکەیان ئەکردە گەردنیان.

کە هەموویان کردن بە دارا جگە لە شێخ سەعید کە دواکەس بوو، ئینجا هـاتن پـەلی ئەویشیان گـرت بـۆ سـەر سـێدارە، بـەڵام ئـەو بـە زەردەخەنــەوە دەســتی لــە دەســتیان راپســکان‌و خــۆی چــووە لای سـێدارەکەو سـەری هـەڵبڕی بـۆ ئاسمـان، سـەیری مـانگی ئـەکرد کـە خەرمانەی دابوو، وایان ئەزانی، ئەبێ فرمێسك بەسەر ریشە سپی‌یەکەیا بێتە خوارەوە!. بەڵام بە پێچەوانەوە بە زەردەخەنەیەکی پر لە هیواوە، وردە وردە چاوی وەرگێڕا بـەلای دەسـتەی مەحکمەکـەوە کـە لەلایـەوە وەستا بوون‌و رووی تێ کردن‌و وتی:

(ئەمشـەو مانگـە شـەوە.. سـوپاس بۆتـۆ خـوای گـەورە کـە ئێمـە شەویشمان هەر رۆژە، چونکە دەرونمان تاریکی تیا نی‌یە.. وە ئەمرۆش ئێمە ئەبینە قۆچی قوربانی بۆ ئازادی کوردستان.. وە ئێمە برگەیەکین لەو قوربانیانەی لاشەکانمان ئەکەین بە پرد بۆ ئەوەی کورد بەسـەریا بپەڕێتەوە بۆ بەری رزگـاری‌و ئازادی.. وە ئـەو مانگـە جوانـەی کـە بـە ئاسمانـەوە خەرمانـەی داوەو ئەدرەوشێتەوە ئەوە هیـوای کـوردە. ئـەو ئەســتێرە گەشــانەی دەورو پشتیشــی ئــەو قۆچانــەن کــە لــە رێی کوردستانا بـەخت بوون‌و ئێسـتا بـە ئاسمـانی کوردسـتانەوە پرشـنگ ئەدەن‌و ئەدرەوشێنەوە، پێویست ناکات کەس بۆ ئێمـە بگری، وە داوای ئێمە کەس‌و کارمان‌و هەموو کوردێك ئەوەیە تەنانـەت دڵیشیان تـەنگ ئەبێ، بەڵکو پێ‌بکەن‌و شانازی بکەن کە ئێمە لەرێی خواو کوردستانا ئەڕۆین‌و دوعای خێرمان بۆ بکەن.. بەڵام ئێوە بۆ خۆتان بگرین هەی تاوانکارینە کە رۆژێك یەت گەلی کورد ئەم رۆژەتان یەنێتەوە بەر چاو..)

ئەمەی وت و دانەوی‌یەوە بۆ زەوی‌و مشتێ لە خۆڵەکەی هەڵگرت‌و ماچی کردو سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕیەوە (وتی خوایە خۆت ئاگاداری ئێمە لە پێناوی ئەم خاکە پیرۆزەدا ئەڕۆین، کە پێی گڵاوی زۆرداران‌و بیگانەی لێ بڕین..) ئەمجارەش مستە خۆڵەکەی دەستی ماچ کردەوەو وتی (.. بەڵێ ئێمە لە ڕێی تۆدا ئەڕۆین، تکامان هەر ئەوەیە ئەو خوێنەی ئێمەو هەموو شەهیدان کە ئەڕژێنە سەرت بیکەی بە گوڵاڵە سورە لە هەموو لایەکا، بۆ ئەوەی نیشانەی خوێن ڕشتنی ئێمەو تۆڵە سەندنەوەی خەڵکی کوردستان بێ...) ئیتر ژەندرمەکان گەیشتە تینیان‌و خۆیان بۆ ڕانەگیراو بەسەریانا خوڕی‌و بێ‌دەنگیان کرد، بە رقەوە پەتەکەیان کردە گەردنی‌و لەقەنارەیان دا.

بەو جۆرە (١٠٣) سێدارە، هەریەکەی لاشەی کوردێکی پێوە هەڵواسرا بوو، بەریز وەك قولاپی قەسابی لەسەر شورەکانی دیار بەکر ڕێز کرابوون.

# هەرگیز لەبیر ناچن

بەو جۆرە، ئەو (١٠٣)قارەمانانەمان لە ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٢٥دا لە شاری (دیاربەکر) بە دەستی کاربەدەستانی فاشیزمی تورکیا لە سێدارە دران.

ئینجا ئەو یادە نەك تەنیا هەر ئەو ڕۆژە بوو کە (٣٥)ساڵ لەمەوبەر ژەندرمە بەکرێ گیراوەکانی تورکیا لە شاری (دیار بەکر)ی خەباتکەری جوانکیلانەدا (١٠٣)سێدارەیان لەسەر شورەکان بەریز بۆ نیشتمان پەروەرانی کورد هەڵخست.. شاری دیاربەکری جوان‌و رازاوەو بێ تاوانیان بە خوێنی کۆرپەکانی خۆی سور کردو پێی تاوانیان نایە سەر خاکە بە نرخە پیرۆزەکەی.

ئینجا وەکو وتمان ئەو یادە بەنرخە تەنیا هەر ئەوە نەبوو وەك روداوێك هەر ئەو ڕۆژە باس کرابێ‌و ئیتر باسی نەمێنێ، بەڵکو گەلی کورد ئەمە (٣٥)ەم جاریەتی یادی ئەوە ئەکاتەوە کە (٣٥)ساڵ لەمەوبەر ژەندرمە تاوانکارە کۆنەپەرستەکانی تورك دژی ئازادی گەلەکەمان وەستان‌و قارەمانانی شۆڕشە خوێناویە مەزنەکەیان لە سێدارە داین.

وە نەبێ نەتەوەی کورد ئەوەی لەبیر بچێتەوە.. بەڵکو ساڵ لەگەڵ ساڵ زیاترو بە پەرۆش ترەوە کۆرپەکانی کوردستان ئەمەیان لەبیر ناچێتەوەو یادی نوێ ئەکەنەوە..

وە وەنەبێ ئەو شەهیدانە کە خوێنیان رژایە سەر خاکی کوردستان بەبێ خاوەن لە ترسی ژەندرمەکانی تورك نێژرابن!!.. نەخێر.. بە

پێچەوانەوە. بەڵکو هەرچەندە ژەندرمە بێ ویژدانە بەکرێ گیراوەکانی ئیمپریالیزم بە دزی خەڵکی کوردستانەوە خستیانە گۆڕەوە.. بەڵام گیانو دڵی هەموو کوردێك لە دوایانەوە لەگەڵ تەرمە پیرۆزە شەهید کراوەکانیانا لەرۆیشتنو بە سرودی (ئەی رەقیب) ەوە، رەوانەی دوایانەیان کردن..

ئاسۆی کوردستانی خۆشەویست وەك بە خوێن گیرا بێ سور هەڵگەرا. دایکە خۆشەویستە بەساڵا چووەکەمان (کوردستانی دڵ هەڵقرچاو) چراوگەی فرمێسکی خوێنینی بەسەر سنگو رویا ئەهاتە خوارەوە..

بەڵێنیدا ئەو کۆرپانەی لەمەولا لە دایك ئەبن، ئیتر ئەبێ بەو خوێنە گەشە سورە شۆڕشگێرەی شەهیدەکانمان گۆش بکرێنو شەو نخونیان بەسەرەوە بکێشێ تا پەروەردەو گەورەیان ئەکات. بۆ ئەوەی بتوانێ لە ئەنجاما نەك تەنها تۆڵەی کۆرپە شەهیدەکانی پێ بکاتەوە، بەڵکو بۆی ببنە سوارەی پارێزەرو سوپایەکی جگەر گۆشە قڕ لە زۆردارو بێگانەی ناو لانەکەی خۆیان بخەنو نەهێڵن لە سنور بێن بەم دیوا، تاکو تۆزێ هەناسەی حەوانەوە بداتو پشوو وەرگرێو ئیتر توشی دەردی سەریو بێ دەرامەتی نەبێ.

هەر بۆ ئەوەشە کە مێژووەکەمان ناهێڵێ ئەوەمان لەیاد بچێتەوە.. ئێمەی کوردیش هەتا هەتایە هەر یادیان ئەکەینەوەو هەموومان بەیەك دەنگ هاوار ئەکەین، بژی یادی شەهیدانی رێی رزگاری کوردو کوردستان.

بەغدا–عوزێری

٢٨ی حوزەیرانی ١٩٦٠.

# شۆڕشەکە بۆ سەرنەکەوت

لەبێ ئێمەی کورد ئەو هۆیە بنچینەیی‌یانە بزانین کە بوون بەهۆی کوژاندنەوەو سەرنەکەوتنی ئەو شۆڕشە مەزنەیەی دیار بەکر، بۆ ئەوەی پەندو وانەی لێ وەرگرین و جارێکی‌تر توشی ئەو هەلانە نەبینەوە، ئەوەش ئەمانە بوو:

١.ئەو هەلە گەورەیەی کۆمیتەی سەروی کۆمەڵی ئیستقلالی کورد، کە هەموو نهێنی‌یەکانی کۆمەڵیان خستە بەردەمی کابرای گەڕۆکی تورکی، کە خۆی کردبوو بە ئینگلیز، وە بۆو بەهۆی ئەوەی حکومەتی تورکیا هەموو نهێنی‌یەکانی کۆمەڵ بزانێ‌و بە ئارەزووی خۆی لە کورد بدات.

٢.بەهەڵە چوونی ڕەزای برای یوسف زیا و کوردەکانی ئەرەزرۆم لە ناوەڕۆکی ئەو بروسکەیەی یوسف زیا لێ ی دابوو بۆ ئاگاداری لە بەتلیسەوە.

٣.بەر بەرەکانی لە نێو عەشایەرەکانی کوردا لەسەر ڕووناکی لەشکری حەمیدیە کە سوڵتان عەبدولحەمید دروستی کردبوو هەر بۆ ئەو نیازە.

٤.ساوایی کۆمەڵی ئیستقلالی کوردو جێگیر نەبوونی بە تەواوی لەناو دڵی خەڵکی کوردستانا.

٥.دەست کردن بە شۆڕش پێش ئەو کاتەی کۆمەڵی ئیستقلالی کورد دایناوبوو.

٦.ناپاکی (قاسم جبری) بێ‌فەڕ، کە بە قەدەر هەموو هۆیەکان کاری کردە سەر کوژانەوەی شۆڕشەکە.

# بەیاننامەی شێخ سەعید لەکاتی شۆڕشدا

[18]تورکـان، عوسمانیـان داخەکـەم بـەناوی دیـین و خەلافـەتی ئیسلامی‌یەوە ئەمە (٤٠٠) ساڵە ئێمەیان بەرە بەرە دیل و ژێر دەست کـردووە، وە بـەرەو تـاریکی و نـەزانیان بردویـن، وەڕێی نـەهاتیان هێناوەتە بەرمان، خۆیان مردووی بەشی زیندەخۆرن، وە لەگەڵ خۆیـان ئێمەش کیش ئەکەن، ئیتر مل کەچی بۆ زۆرداران و تاریکی پەرستان.

ئەم تورکانە هەر لە مێژەوە بە کۆچەری هاتونەتە ناومان وە بەفڕو فێڵ خۆیـان دامەزراندووە، وڵاتـی ئێمـەیان وێـران و داگیر کـردووە، کوردسـتان هـەرگیز وەك ئـەمڕۆ کـاول نـەبووە وە ئـاوا هێلانـەی بایەقوشان و شوێنی گورگان و بوزقوردانی تۆرانیـان نـەبووە، وڵاتمان وابـێ بـەش و هـەژار نـەبووە بـەڵام حـاڵی ئـەمڕۆمان سـەرگەردانی و ماڵوێرانی‌یە، وە هیچ کوردێك، هیچ دیندارێك قبوڵ و پەسەندی ناکات.

پێویستە لەسەر هەمووان لەم ژیانە تاڵ و بێ بەختیە خۆمان رزگار بکەین لەبەر ئەوە پێویستە لە رێگەی راست و هەق پەرستی لا نەدەین،

---

[18] ئـەم بەیاننامەیـەم لـە گۆڤـاری رۆژی نـوێی ژمـارە ٧ی سـاڵی یەکەمـەوە وەرگرت، کە نوسراوە لـە ٤ی مارتی ١٩٢٤دا بڵاوکراوەتـەوە، بـۆ ئـەوەی بـەرواری هەموو رووداوەکان بەراستی بنوسم هەر لەو هەڤاڵە پەنا هێنەرەم پرسی کە خۆی خەڵکی دیار بەکرە، وتی شۆڕشی دیاربەکر لە رۆژی ٨ی شوباتی ١٩٢٥دا دەستی پێ کرد، وە ئەم بەیاننامەیەش بیست و پێنج رۆژ دوای ئەوە دەرکرا واتە لە رۆژی ٤ی مارتی ١٩٢٥دا، وە بە هەموو ناوچەکانی شۆڕشدا بڵاوکرایەوە.

لە مردن نەترسین لەڕێی هەق سەندنا نەبەزین، بۆ هەستی ناوبانگی باپیران و گەل و وڵاتمان خۆمان و گیانمانی بۆ فیدا بکەین.

بەرامبەر بەسەربازانی تورك بەتایبەتی بەرامبەر بە ئەفسەران و سەرۆك و قوماندانەکانی تورك کە دەربارەی ژن و کچ و منداڵانمان زۆر بێ بەزەییانە ئەبزونەوە، وە بە پێچەوانەی دین کوشتار ئەکەن، بوەستن با تۆڵەی ئەم بەسەزمان و بێدەسەڵات و بێچەکانە بسێنین و خوێنیان ون نەکەین، بەڵام بەرامبەر بە دیل و زامداران نەرم و نیان بن..

بەرامبەر بەو سەربازە تورکانەش کە شەڕ ناکەن و خۆیان بەدەست ئێمەوە ئەدەن (تەسلیم ئەبن) پێویستە نەرم و نیان بین و وەك برای خۆمان رەفتاریان لەگەڵ بکەین لە شەڕا دەستتان نەلەرزێ، لە مردن نەترسن چونکە ژیانێکی هیچ و پوچ دوور لە جیهان، ژیانی بێبەشی و بێ دەسەڵاتی ژیانی پڕ خەم و سزاو ناسۆر خەفەت و کەساسی بۆ هەمووما شەرمەزارییە، مردنێکی ئازایانە گەلێك لەو ژینە خۆشترە.

ئاشکرایە کە تورك بێ پەیمانن و بەرامبەر بە کورد زۆر زۆردارانەو نامەردانە ئەجولێنەوە، ئێمەی کوردیش ئەبێ دەرسێکی ئەوتۆ بە تورکان بدەین کە هەرگیز لەبیریان نەچێتەوە، وە روو رەشی و رەفتاری گورگانەی تورکان بۆ هەموو جیهان دەرخەین کە چۆن بێکەڵك و ویرانە پەرست و گورگ و درندەو خوێنخۆرن.. لەباتی لەناو ئەم زۆردارانەدا بێ کەڵك بژین بەکۆمەڵ مردن لەرێگەی هەق و رزگاریدا شەهید بوون گەلێك شیرین و خۆشترە.

تا مردن ئێمەمانان بۆ ئەو برا کوردانە، بۆ ئەو منداڵە نازدارانە کە لە دوای ئێمە ئەژین ئەبێ مەشق و دەرسێك لەگیان بازی ئێمە وەرگرن، وە بۆ دوارۆژی ژیانیان گەوهەرێکیان پێ ببەخشین. تا لەڕێی هەق

پەرستیو رزگاری لانەدەنو بەرەو روناکی ژیان بڕۆن، بیان جوڵێنێ.. هەوڵدەن بابە رویەکی سورەوە بژین. باهەموومان لەرێی ئازادیو سەرفرازیدا بەکۆمەڵ بمرینو ناوو نیشانێکی بەرز بۆ نەتەوەکەمان پەیدا بکەین بە یەکێتیو برایەتی بەکۆمەڵ کۆشش کردنو راپەڕین زۆر بەرزییە، وە ئەبێ بەجیهانی رابگەیەنین کە ئێمە بەرامبەر زۆرداریو نارەواییو نادادی راپەڕیوینو بەرەنگاری بوینەتەوە، ئەبێ هەوڵ بدەین لە هەردوو دنیادا برایەتیمان راگرینو هەق پەرستیمان پەروەردە کەین تا بەرامبەر خواو هەقو ئادەمیزاد شەرمەزار نەبینو لە هەردوو دنیا بێبەش نەبین.

ئەی گەلی کورد، چاکەو خراپە بەدەست خۆمانە (بە بیرو کردەوەی خۆمان نەبێ هەرگیز رزگارمان نابێ، وەلەتاریکییەوە ناگەینە رووناکی) ئەبێ کۆشش بکەین ئینجا هەردوو دنیامان دەست کەوێ، لەژێر زۆرداری تورکانا زۆرماینەوە ئەگەر هەر چاوەڕوانی ئەوان بین بێ دەستو بێگیان بۆگەن ئەکەینو ئەرزین.

ئەمە چوار چەرخە هەتا ئەمڕۆ تورکان مەشقی کینەو دوژمنایەتیو تەمەڵیو بێکاریو یەکتر کوشتنو تالان کردنو ماڵوێران کردنمان دا ئەدەن، هەرگیز نەزاکەتو نەرمو نیانیو یەکتری خۆش ویستنو لێ بوردنو زانستو هونەریان فێر نەکردوین. هەمیشە رێو شوێنی کۆچەریتیان نیشان داوین.. تاکەی واسستو بێ کەڵك دوژمن بە یەك بین؟.. ئیتر رۆیشتن لەسەر مەشقو رێگەی تورکان رۆیشتن بەس بێ.. هاوکاری لەگەڵ (کەمالییەکان) بۆ کوردان چ بۆ دونیاو بۆ ئاخیرەت نەهاتی ئەبەخشی.. ئیتر بەرەو رووناکیو ئازادی بەرەو برایەتیو ئادەمیزاد پەروەری..

کوردان، هەر لە چەرخی (مەمو زین)ەوە تا ئەمڕۆ ژیانمان ساز نەکرد، گیانی پاکیو باوو باپریمان شاد نەکرد. ئاواتی ئەحمەدی خانیمان نەهێنایە دی، بۆیە پەرێشانو سەرگەردان ئەژینو دوژمنانمان بەخۆشادکرد.

ئیتر گیانی ئەحمەدی خانی، دەنگی شیرینی ئازادی (مەمو زین) بوڵند بکەنەوە، ئاواتی باوو باپیرانمان بژینەوە، ئامانجیان بێننە دیی.

ئەی گەلی کورد، زۆر باش ئەزانن کە لە ڕۆژی ڕەشو نەهاتیدا تورک هاواری بۆ کورد هێناوە، بەلام لە ڕۆژی خۆشیدا نەتەوەی کوردی نەناسیوە، وە لە دەست کەوتەکانمان کوردی بێبەش کردووە، وەنەك هەر ئاوا بێ پەیمانی نواندبێو پەیمانی شکاندبێ، بەڵکو کە بۆشی هەڵ کەوتبێ نیزەو سۆنگیەکەشی دەرهێناوەو بەرەو سنگی کوردی ئاراستە کردووە.. بەم ڕەنگە نامەردانە بە خیانەت پاداشتی کوردی داوەتەوە.. فاعتبروا باولی الابصار.

شێخ سەعیدی نەقشبەندی-پیران.

# ژیانی شێخ سەعیدی پیران

*شیچخ سەعید کوڕی شێخ مەحمود کوڕی شێخ عەلیە، لە ساڵی ١٨٦٥ی زاینی لە دێی (گادار) لە کوردستانی تورکیا هاتۆتە دنیاوە.

*لەدوای ئەوەی تۆزێ نەش و نمای کردووەو گەورە بووە چۆتە دێی (پالۆ) کە ئەکەوێتە ناحیەی "مەنشی کورد" لیوای "گەنج"ەوە.

*شێخ سەعید لەسەر دەستی شێخ مەحمودی باوکیا تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتووە کە باوکیشی لە (شێخ عەلی)باوکی وەرگرتبوو، وە شێخ عەلیش لە (مەولانا خالد).

*شێخ سەعید لە شەرع و ڕێو شوێن و راوێژی ئاینیدا زۆر شارەزا بوو دەستێکی باڵای هەبووە، باوکی زۆری خۆش ویستووە چونکە گەلێ زیرەك و چالاك و چاونەترس بووە، گەلێ هەڵبەستی بە کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی وتووە.

*کە باوکی لە ساڵی (١٨٩٦)ی زایینی‌دا کۆچی دوایی کرد شێخ سەعید تەمەنی (٣١)ساڵان بوو، بوو بە جێنشینی باوکی لە هەموو کارو بارێکا.

*لە دوای مردنی باوکی چووە (خەنس) جێنشین بوو، لەوێ بوو هەتا ژەندرمەکانی ئەتاتورك زۆریان بۆ هێنا، بۆ ئەوەی خۆی لەو زۆر بۆ هێنانە رزگار بکات هەڵسا لە (خەنس)ەوە چوو بۆ دێی پیران بۆ ماڵی (شێخ عەبدولرەحیم)ی برای لەوێ مایەوە.. هەتا تەنگ پێ هەڵچنینی ژەندرمەکانی ئەتاتورك لەو رۆژەوە چووە دەرەوەو بوو بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕش لە ٨ی شوباتی ١٩٢٥دا.

*شێخ سەعید کوردو کوردستانی لە سەروو هەموو ئامانجێکی ئەگرت‌و بۆ سەرکەوتن‌و رزگار بوونی هەوڵی ئەدا بۆیە لە هەموو کۆمەڵ‌و رێکخراوەکانی کوردستانا بەشدار بووەو سەرکردەیی شۆڕشی دیار بەکری خوێناوی کردو لە پێناوی ئازادی‌و رزگاری کوردو کوردستانا لە رۆژی ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٢٥دا لەگەڵ (١٠٢)کورد پەروەری ترا بە دەستی کار بەدەستانی تورکیا خنکێنرا.. هەر (١٠٣)کەسەکەیان کران بەووریزە قەنارەیەدا کە لەسەر شورەکانی دیار بەکر وەك قولاپی قەسابی بۆ شۆڕشگێرانی کورد هەڵخرابوون.

## سەرچاوەکان:


| | |
|---|---|
| شەرەفنامە | شەرەفخانی بەتلیسی |
| شۆڕشەکانی کورد | علادین سجادی |
| ئیماراتی بەهدینان | صدیق الدملوجی |
| یاداشتی (بەك) | رفیق حلمی |
| ڕۆژنامەی خەبات | ئۆرگانی پارتی دیمکراتی کوردستان |
| القضیة الکردیة | بلەچ شێرکۆ |
| گۆڤاری دیاری کوردستان | ژمارە ١٣-١٤/١٩٢٦ |
| سیرة مصطفی کمال | محمد عزت |
| القضیة الکردیة | نعروف چیاوك |